# پیشانگای روژی کوردەواری لە شەوەی عەبدجباری






دانەر

مەلا حسین شێخ سەعدی

بەرگی : دووەم

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ

بشیر حسین سەعدی (١٩٥٢)

# پڕشنگی ڕۆژی کوردەواری

# لە شەرحی بوخاری


دانــەر

مەلا حسین شێخ سعدی


بەرگی دووەم


نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ :

بشیر حسین سعدی


لە ساڵی ١٩٥٢ داندراوە

---


بەغدا چاپخانەی (الامه) — ١٩٩٠ —

- پرشنکی ڕۆژی کوردەواری لـە شەرحی بوخاری ٠
- دانەر : مەلا حسین شیخ سعدی ٠
- بەرگی دووەم ـ ١٩٩٠ ـ چاپکراوە ٠
- نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ :
  بشر حسین سعدی ٠
- لـە ساڵی ١٩٥٢ داندراوە ٠
- ( ٣٠٠٠ ) دانەی لێ چاپکراوە ٠
- لەسەر ئەرکی نووسەر چاپکراوە ٠
- بەغدا چاپخانەی ( الامه ) ٠
- سەربەرشتی چاپ : سەعدوڵلا شیخانی ٠

● هەولێر : بشیر حسین ●

# - پێشەکی -

باش تەواوبوونی بەرگی یەکەم لە تەرجەمەی - فەرموودەکانی سەروەری گەورەمان محمد (د) • لەلایەن زانای گەورەی ئاینی خوالێ خۆشبوو مەلاحسین شیخ سەعدی ڕەحمەتی خودالێبی •

کە بەرگی یەکەمیش - پرشنگی ڕۆژی کوردەواری - دا • بریتیبوو لە پێشەکیو مێرووی ژیانو داندراوەکانی ئەوا بەگی دووەم کەوتە بەردەستی لەبەر ئەوە بەپێویستم نەزانی کەدووبارەی بکەمەوە لەم بەرگەی خوێندەوارانی بەرێز کەئەویش بریتی‌یە لە (١٧٤) سەدو حەفتاو چوار فەرموودەی پێغەمبەر (د) لەگەڵ دیارکردنی ئەحکامی شەرعیەو ڕایچوار مەزهەبەکانی ناسراو • وەبە یاریدەی یەزدانیپاك بەرگی سێیەمیش لەم نزیکانە دەکەوتە بازاڕ هەتا هەموو ئەو حەدیثانەی کە تەرجەمە کراون لەلایەن دانەر کەژمارەیان (١٤٣٨) حەدیثە • تەواودەبێ ئیتر سەرکەوتووبن •

بشیر حسین
بلاوکەرەوە

٢٠١ عن أبي سعيد الخدري (رض) قال سمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يقول انه لا يسمع مدى صوت المؤذن جن ولا انس ولا شيء الا شهد له يوم القيامة

( تەرجەمە )

٢٠١ دەگێرنەوە لە ئەبوو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێبی گوتی بیستم لەپێغەمبەری خودا (د) دەیفەرموو بەڕاستی نابێ ئەوەندەی دەنگی بانگدەر بڕوا جنوئینسانو هەرشتێك ( یەعنی لەدارو بەردو حەیواناتو شتی تریش )

مەگەر هەموو ڕۆژێ لەقیامەت شاهیدی بۆ دەدەن کەئەم بیاوە ئیماندارەو خودا بەیەك دەزانی

٢٠٢ عن أبي سعيد الخدري (رض) ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال اذا سمعتم النداء فقولوا مثل ما يقول المؤذن ٠

( تەرجەمە )

٢٠٢ دەگێرنەوە لەئەبوو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێبی ـ گوتی بێگومان پێغەمبەری خودا (د) فەرمووی وەکوو گوێتان لەبانگی نوێژبوو ـ بانگدەر ـ مؤذن ـ چی گوت ئێوەش وەکوو ئەو بلێن ٠

٢٠٣ عن معاوية (رض) مثله الى قوله واشهد ان محمــداً رسول الله ولمــا قال حي على الصلاة قال لا حول ولا قــوة الا بالله وقــال هكــذا سمعت نبيكم (ص) يقول ٠

( تەرجـمەە )

٢٠٤ دەگێڕنەوە لەمەعاویە ـ رەزای خودای لێبێ ـ هەتا کەلیمەی شەهادەتەین ٠ بەلام وەکــور گوتی حي على الصلوة ٠ پێغەمبەر (د) فەرمووی ٠ لا حول ولا قوة الا بالله ـ یەعنی لاچون لەگوناهان نی‌یە ٠ وەهیچهێزیش لەسەر طاعەت‌نی‌یە بەخودا نەبێ ٠

گوتی بەم ڕەنگە بیستم پێغەمبەر (د) جوابی بانگی دەداوە ٠

٢٠٤ عن جابر ابن عبدالله رضي الله عنهما ٠ ان رسول الله (ص) قال من قال حين يسمع النداء ٠ اللهم رب هــذه الدعوة التامة والصلوة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاما محموداً الذي وعدته ٠ حلت له شفاعتي يوم القيامة ٠

( تەرجـمەە )

٢٠٤ دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبدالله ڕەزای خودای‌لێ‌بێ ـ بێشك پێغەمبەری خودا (د) فەرمووی هەرکەسێك‌بلێ : وەکوو گوێی لەبانگ دەبێ ( یەعنی لەپاش بانگ ) ٠ ئەم دوعایەی اللهــم رب هــذه الدعوة التامة ٠٠٠ هتد ٠ نائیلی شەفاعەتی من دەبێ ڕۆژی قیامەت ٠

٢٠٥ عــن أبي هريرة (رض) ٠ ان رسول الله

(ص) قال لو يعلم الناس ما في النداء ٠ والصف الأول ثم لم يجدوا الا ان يستهموا عليه لاستهموا ولو يعلمون ما في العتمة والصبح لأتوهما ولو حبوا ٠

( تەرجەمە )

٢٠٥دەگێرنەوە لە ئەبووهورەیرە ڕەزای خوای لێ بی بەحەقیقەت پێغەمبەری خودا (د) ٠ فەرمووی ئەگەر خەلقی بیزانیبوایە ثەوابی بانگدانو ثەوابی نوێژی ڕیزی پێشوو لەجەماعەت چەند زۆرە ٠ بەدەستیشیان نەکەوتایە بەقورعەنەبێ ٠ قورعەیان دەهاویشت یەعنی بەبێ قورعە هیچ کەس بانگی نەددەدا وە بەبێ قورعەش هیچ کەس لەصەفی یەکەم نەدەبوو وە ئەگەر بیشبانزاینبوایە زوو چوونە مزگەوت لە کاتی نوێژ خێری چەند زۆرە ٠ بۆ زوو چوونەمزگەوت عالەم مسابەقەی دەکرد ٠ وە ئەگەر بشیانزانیبوایە چیثەوابێکی زۆر لەجەماعەتی نوێژی عیشاو سبەینە هەیە ٠ دەچوون بۆ ئەم دوو نوێژو جەماعەتە ٠ ئەگەر بەدوودەستو ئەژنۆوقوونەخشکە بڕۆیشتنایە ٠

٢٠٦ عن ابن عمر رضي الله عنهما ٠ ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ قال ان بلالا يؤذن بليل فكلوا واشربوا حتى ينادي ابن أم مكتوم ٠

( تەرجەمە )

٢٠٦ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی ٠ بەڕاستی پێغەمبەری خودا (د) فەرمووی ٠ بەتەحقیق ( بلال ) لەشەودا بانگی بەیانی دەدا ٠ ئنجا بخۆن وبیشخۆنەوە هەتا عبداللەی کوڕی ئومی مەکتوومی حافظ بانگ دەدا چونکی ئەو لەپاش بەیانیدان ( فجر )

بانگی دەدا • لەبەر ئەوەی پیاوێکی کوێربوو هەتاپێیان نەگوتایە سبەینەیە • سبەینەیە بانگی نەدەدا •

تیبینی ( ملاحظە )

ابن ام مکتوم ناوی عەمری کوڕی قەیسی کوڕی زائدة قورەیشی نومی مەکتومیش ناوی عاتیکەی کچی عبداللەبوو لەبەرەی (مەخزوم) بوو•

٢٠٧ عن عبدالله ابن مسعود (رض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • لا يمنعن احدكم • او احداً منكم أذان بلال من سحوره فأنه يؤذن بليل ليرجع قائمكم ولينبه نائمكم • وليس ان يقول الفجر • أو الصبح • حتى يقول هكذا •

( تەرجەمە )

٢٠٧ دەگێڕنەوە لە عبدالله کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بێ ئەویش لەپێغەمبەر (د) فەرمووی بامەنعی یەکێکتان نەکا بانگدانی بلال لەخواردنی پاششیو • چونکی بلال لەشەوبانگ دەدا بۆخاتری ئەو کەسەی تەهەجودی کردووە کەم خەوتووە • بیگێڕیتەوە بۆلەحظەیەك خەوتن • ئەگەر بخەوی بۆ نەشاطو حەسانەوە یاپاششیو بخوا • ئەگەر بەڕۆژووبێ وە بۆخاتری ئەوکەسەی لەخەوداماوە • بەئاگای بینی • وانی‌یە بەیانیڕاست ( فجر الصادق ) بەم هەیئەتە بەدیار بکەوی ( ئیشارەی بە ئەنگوستەکانی کرد بۆهەوراز لەپاشان نشێوی کردنەوە خوارێ بۆ وەصفی فەجری کاذب ( بەیانی ناڕاست ) • هەتا بەدیار دەکەوی بەم هەیئەتە ( ئیشارەشی دەکرد بەدووئەنگوستی شەهادەی

هەردوو دەست · بە اجتماعیان پاشان بە ئیفتراقیان بەلایی ڕاستو چەپ بۆوەصفی فەجری صادق ) ·

٢٠٨ عن عبدالله ابن مغفل المزني (رص) · ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم قال بين كل أذانين صلاة ثلاثاً لمن شاء ·

( تەرجەمە )

٢٠٨ دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی موغەفەلی موزنی ڕەزای خودای لێبی · بەحەقیقەت پێغەمبەری خودا (د) سێجار لەسەر یەکتری فەرمووی لەبەینی هەموو بانگو قامەتێك نوێژێك هەیە ( ئنجا لەبەر ئەم حەدیثە هەندێ ئەهلی تەقوا لەبەینی بانگو قامەتی مەغریب دوو ڕکعەت دەکەن ·

٢٠٩ عن مالك ابن الحويرث (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال ارجعوا فكونوا فيهم وعلموهم وصلوا فاذا حضرت الصلاة فليؤذن لكم احدكم وليؤمكم اكبركم ·

( تەرجەمە )

٢٠٩ دەگێڕنەوە لەمالك کوڕی حویرث ڕەزای خودای لێبی · گوتی بەخۆمو بەچەندکەسێك لەناو قەومی خۆم هاتمە خەدمەت پێغەمبەر ( د ) بیستشەو لەخدمەتی پێغەمبەر دانیشتین · زۆر بە بەبەزەییو بەرەحمبوو · پاشان وەکووزانی حەزمان لێیە بگەڕێینەوەلای خزمکەسمان فەرمووی : بچۆنەوە · لەناویاندابن · فێری کاروباری

دینیان بکەن • ئاگاتان لەپێنج‌فەرز نوێژی خۆتان‌بی • بایەکێکتان بۆتان بانگ بدا • هەرکامەشتان بەتـەمەن گەورەترە باپێش نوێژیتـان بۆبکا (ش) چونکی مالکببـەرەفیقەکانی‌یەوە لەزانین‌و گـــەورەبی وەکوو یــەك بووینە • بۆیەپێش نوێژی داوە بەگەورە تریان • ئەگەرنا زاناتر لـەعیلم وشەریعەت دەبێ پێش نوێژی بکا • باگەنجیش بێ •

## ٢١٠ عن مالك ابن الحويرث : (رض) : قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • اذا انتما خرجتما فأذنا ثم أقيما ثم ليؤمكما اكبركما •

**( تەرجـەمە )**

٢١٠ دەگێرنەوە لەمالك کوڕی حوەیرث ڕەزای خـودای لێ‌بی • دووپیاو ویستی‌یان سەفەر بکەن • هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکـوو ئێوە دەرکەوتن بۆسـەفەر بانگ بـدەن ( یەعنی هـەرکامێکتان حـەزتان‌کرد بانگێك بدەن • پاشـان قامەت بکـەن وە گـەورەتریشتان بەتەمەن باپێش‌نوێژیتان بۆبکا •

## ٢١١ عن ابن عمر رضي الله تعـالى عنهما ان رسول الله صلى الله تعالى عليــه وسلم • كان يأمر مؤذناً يؤذن • ثم يقول على اثره الا صلوا في الرحال في الليلة الباردة • أو المطيرة في السفر •

**( تەرجـەمە )**

٢١١ دەگێرنەوە لە عبدالله‌ی کوڕی عومەر بە تەحقیق پێغەمبەری خـودا (د) لەسەفـەردا لەشـەوی سارد یاخۆ باران بوایە • ئـەمری

دەفەرموو • بانگدەرێك بانگبدا • لەپاش بانگ دەی فەرموو ئاگاداربن هەرکەس لەمەسکەنی خۆیو بارخانەی خۆی نوێژبکا •

٢١٢ عن أبي قتادة (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • ما شأنكم • قالوا استعجلنا الى الصلوة • قال فلا تفعلوا • اذا أتيتم الصلوة فعليكم بالسكينة • فما ادركتم فصلوا وما فاتكم فأيموا •

( تەرجـەمە )

٢١٢ دەگێڕنەوە لەئـەبوو قـەتادە ڕەزای خـودای لێبی گوێی وەقتێك ئێمە لەم نوێژدا بووین لەگەڵ پێغەمبەر (د) • لەناکاو گوێی لـە دەنگـەدەنگێو هـەرایەکبوو پاشـان وەکوو نوێژی کـرد • فـەرمووی ئەمەچیتانبوو • گوتیان پـەلەمانکرد بۆنوێژ • فـەرمووی ئەمەنەکەن • وەکوو هاتن بۆنوێژ • دەبی بێپەلەو لەسەرەخۆبن • ئەوەندی گەیشتنێ بیکەن • ئەوەندی نەگەیشتنێ بۆخۆتان تەواوی بکەن • لەپاش سـەلام دانەوەی ئیمام •

٢١٣ عن أبي قتـادة (رض) • قال النبي صلى الله تعالى عليـه وسلم اذا أقيمت الصلوة فلا تقوموا حتى تروني •

( تەرجـەمە )

٢١٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو قەتادە ڕەزای خودای لێبی • پێغەمبەر (د) • فەرمووی وەکوو قامەت کرا بۆنوێژ • ئێوە هـەڵمەستن • هـەتا

مندەبینن کەهاتوومەتە دەرێ لەحوجرەی خۆم · مەبادا زۆر دەوام بکەن لەسەرپێیان یاخۆشتێکی موجب بۆ دواکەوتن بۆمن ڕووبدا · (ش) : لای ئیمامی ئەعزەم وەکوو قامەت کرا جەماعەت هەلدەستن لە ( قد قامت الصلاة ) ئیمام ( ئەوەی پێش نوێژی دەکا ) تەکبیری تەحروم دادەبەستی · بەلام لای جمهورو ئیمامی شافعی قامەت تەواوبکرێ · ئنجا نوێژکەرەکان هەل بستن · ئەبوو یوسفیش لەسەر ئەم قسەیە لای ئیمامی مالکیش گوتی وەقتی هەلستان بۆ نوێژ ئەوەلی قامەتە : ئیمامی ئەحمەدیش گوتیەتی وەکوو گوتی ( حي علی الصلاة ) ·

## ٢١٤ عن أنس (رض) قال أقيمت الصلوة والنبي صلى الله تعالى عليه وسلم يناجي رجلا في جانب المسجد فما قام الى الصلوة حتى نام القوم ·

( تەرجەمە )

٢١٤ دەگێرنەوە لەئەنەسی کوڕی مالك ڕەزای خودای لێ بێ · گوتی قامەت کرا بۆنوێژی عیشا پێغەمبەریش (د) · لەلای مزگەوتی مەدینە گفتوگۆی لەگەل پیاوێك دەکرد · بۆنوێژ تەشریفی هەلنەستا · هەتا هەندێ لە ئەهلی جەماعەت خەویان لێ کەوت لەروایەتەکیش ( حتی نعس بعض القوم ) یەعنی هەندێکیان بۆرژین پاشان هەر بەقامەتی پێشوو تەشریفی فەرموو نوێژی کرد · لەم حەدیثە پیرۆزە وادەزاندرێ قسەکردن لەپاش قامەت بۆنوێژ دروستە بەلام لای حەنەفیەکان مەکروهە ئەگەر پێویستو ( ضەروری ) نەبێ ·

# ( باب الجماعة )

## باسی نوێژی بەکۆمەڵ

ئیمامی شافعی دەفەرموێ قامەت تەواوبکرێ ئنجا نوێژکەرەکان پێویستە هەڵبستن ٠

٢١٥ عن أبي هريرة (رض) ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ قال والذي نفسي بيده لقد هممت، أن آمر بحطب فيحطب ٠ ثم آمر بالصلوة فيؤذن لها ٠ ثم آمر رجلا فيؤم الناس ٠ ثم أخالف الى رجال ٠ فأحرق عليهم بيوتهم ٠ والذي نفسي بيده لو يعلم احدهم انه يجد غرقاً سميناً أو مرماتين حسنتين لشهد العشاء ٠

( تەرجەمە )

٢١٥ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێبێ ٠ کەبەتەحقیق پێغەمبەری خودا فەرمووی قەسەم بەوزاتەی کەروحی منی بەدەستە ٠ بەڕاستی قەصدم کرد ( ویستم ) ٠ کەداری سووتەنی کۆبکرێتەوە پاشان ئەمربکەم ٠ بەنوێژو ٠ مۆذنیکیش بانگ بدا ٠ پاشان ئەمربکەم بەپیاوێك بۆخەلکی ببیتە ئیمام ٠ پاشان خۆشم لەسەر خلافی ئەوانەی خەریکی نوێژن ٠ بچمەلای ئەوپیاوانەی کە دەرنەچووینە بۆنوێژ

لەخانووی خۆیان خانوەکانیان بەسەرداْ بسووتێنم ٠ بەحەقی ئەو زاتەی کەڕوحی منی بەدەستە ٠ ئەگەر یەکێك لەپاش کەوتوانی نوێژبی ئێسقانێکی بەگۆشتی دەست بکـــەوێ ٠ یاخۆدووسمە مـــەڕی خۆشی بەگۆشـــتی دەست بکەوێ ئامادەی نوێژی عیشادەبوو ( یەعنی ئەگەر بزانی لەنوێژکردن کەلکێکی دونیایی هەیە ٠ باکەمیش بێ بۆنوێژ دەهات لەبەر ئاگالێ نەبوونی لەخۆشی و پلەکانی ئاخرەت ٠ وە هەولدانی هەر بۆ دونیا ٠

(ش) بەم حەدیثە ئیمامی احمد استدلالی کردووە ئەـوکەسی دەلێ جەماعەت فەرزی عەینە ٠ چونکی ئەگەر سونەت بوایە ـ گەفی لەوکەسە نەدەکرد کەجەماعەتی ناکا بەسووتاندن ٠ وە ئەگەر فەرزی کفـــایەش بوایە ٠ هەلستانی پێغەمبەرو ئەصحاب بەکـــردنی نوێژی بەجەماعەت بەس بوو ٠ کەئەوانی نەهاتوونە عەزاب بدرێن ٠ بۆ ئەم قسەیە ٠ ئـــەم قسەیان پەســـندکردووە ـ عەطاءو ئەوزاعی و کۆمەلێك لەموحەدیثـــانی تائفەی شافعی ٠

بەلام مەرج نی یە بۆ صحەتی نوێژ ٠ یەعنی ئەگەرکەســـێك نوێژ بەتەنیاش بکا نوێژەکەی ڕاستە ٠ بەلام لای ئیمام ئەبوو حەنیفە وەئیمامی مالك وەهەندێك لەشافعیەکان دەلێن سونەتێکی مۆکدەیە بەدەلیلی حەدیثی مسلم و بوخاری ( صلاة الجماعة افضل من صلاة الفرد ٠ بسبع وعشرين درجة ) ٠ واتە نوێژی بەکۆمـــەل بیست وحەوت پلەی لەســـەر نوێژی بەتەنیاهەیە ٠ قەسطەلاینش گوتوویەتی خوێنـــدوومە لەشەرحی مجمـــع ( ابن قرشتای ) کەبەشی زۆری زانایان لەسەر قسەی وجوبی جەماعەتن ٠ کەناویان بردووە بەسونەت جونکی وجوبەکەی بەسونەت ثابتە ٠ بەلام لای قەولی ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خوای لێ بی جەماعەت فەرزی کفایەیە ٠ یەعنی ئەگەر لەدێیسك دووکەس نوێژی بەجـــەماعەت بکـــەن گوناهی

جەماعەت نەکردن لەســەر ئەوانی‌تر هەلدەستێ • بۆئەوکەسانەی دەلێن جەماعەت فەرزی عەین‌نی‌یە • بۆلەحەدیثی مسلم‌وبوخاری کەڕابورا • دەلیلێکی تریان هــەیەکەلەسیاقی عــەینی حــەدیث دەزاندرێ • بــەم تەرزەگووتوویانە وازهینــــانی پێغەمبەر لەنوێژ بۆســــووتاندنی عالــەم وەسوێندخواردنی بۆسووتاندنی ئەوانەی جەماعەت ناکەن • وە ئەم‌هەموو ترساندنەی بەسووتاندن • لەلایەن پێغەمبــــەر ڕووی نەداوە کـــەسی سووتاندبێ ئەوە بەلگەیەو دەلیلە لەسەر اختصاصی ئـــەم حەدیثـــە بەمنافقانی منکـــری جەماعەت • یاخـــۆ ئایاچی‌خەیالێك بەدلی ڕۆناکی پێغەمبەردا • دەرحەق بەچەقەومێك یادەرحەق بەکێ • بەدلیداتێپەڕیوە • لەگەل‌ئەوەش ئازاردانی مەخلوق بەئاگر تایبەتە بەخودای گــەورە • وە ئەم حەدیثانەی کەلەپاش ئەمەش دەنووسرێن ناسخن (واتە رەش‌کەرەوەنە) بۆ ئەم حەدیثە •

٢١٦ عــن ابن عمــر رضي الله عنهمــا • ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • قـــال صلاة الجماعة تفضل صلاة الفرد بسبع وعشرين درجة •

( تەرجــەمە )

٢١٦ دەگێڕنـــەوە لەعبداللەی کوڕی‌عمــــر ڕەزای‌خودای لێ‌بێ بەڕاستی پێغەمبەری خودا (ص) فەرمووی نوێژی بەجەماعەت • گەورەترە لەنوێژی بەتەنیا بەبیست‌وحەوت دەرەجــە • ( یــەعنی بیست‌و حــەوت ئەوەندەی نوێژی بەتەنیا خێری زیاترە • لەمزگەوتی مەکــەو مەدینــەو قودس نەبێ • لەم سێ‌مزگەوتە نوێژی بەتەنیاخێری زیاترە لەجەماعەتی

جێگایانی‌تر ٠ جەماعەتیش بەیەك ئیمام و یەك کەسیش لەدوای نوێژ بکـا دەبێتە جەماعەت بەدەلیلی حەدیثی ( الاثنان فما فوقها جماعة ) ٠

٢١٧ عـن أبي هريرة (رض) ٠ قـال سمعت رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ يقول تفضل صلوة الجميع صلاة احدكم وحـده بخمس وعشرين جـزءا ٠ وتجتمع ملائكة الليل وملائكة النهار في صلاة الفجـر ٠ ثم قـال ابو هريرة فاقرءوا ان شئتم ( ان قران الفجر كان مشهودا ) ٠

( تەرجـەمە )

٢١٧ دەگێرنەوە لەئـەبوو هورەیرە ڕەزای‌خودای لێ‌بێ ٠ گوتی بیستم لەپێغەمبـەری خـودا (د) دەی‌فـەرموو نوێژی بەجـەماعەت ٠ بەبیست‌وپێنج بەش پاداشتی زۆرترەو گـەورەترە لەنوێژی بەتەنیـا ( یەعنی‌هەموو نوێژێك ئەگەر دابەش‌بکرێ بەسەر بیست‌وپێنج‌بەش یەك‌جێ عائدبەنوێژی تەنیایە ٠ بیسـت‌و پێنج‌جێی‌تەواویش عائدبە نوێژی بـە کۆمەڵە ) ٠ وە مەلائکەی شەووومەلائکەی ڕۆژیش ٠ لـەنوێژی بەیانی‌دا کۆدەبنەوە پاشان ئەبوو هورەیرە گوتی ئەگەر حەزدەکەن بۆ باوەڕکردنی ئەم‌حەدیثە ئەم ئایەتە بخوێننەوە ( ان قرآن الفجر كان مشهودا ) ٠ یەعنی نوێژی بەیانی بەسترااوو دیارە لەمەلائکان شاهیدی لەخدمەت خودا بۆدەدن ٠

٢١٨ عن أبي موسى (رض) قال ٠ قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ اعظم الناس أجراً

في الصلاة ابعدهم فابعدهم ممشىً · والذي ينتظر الصلاة حتى يصليها مع الامام · اعظم اجرا · من الذي يصلي ثم ينام ·

( تەرجەمە )

٢١٨ · دەگێرنەوە لەئەبوو موسی ـ ڕەزای خودای لێبێ ـ ئەوی پێغەمبەر فەرمووی (د) · گەورەترینی خەلکی · بەئەواب و پاداشت · بەپاداشت‌ترینیان دوورترین لەپاش دورترینیان بەڕێگا · ( یەعنی چەند ڕێگەی دوورتر بێ ـ هەنگاو زیاتر باوێ · خێری زیاترە وەئەو کەسەی چاوەڕێی نوێژیش دەکا · هەتا لەگەل ئیمام بەجەماعەت دەیکا · باکەمێکیش تەئخیر بێ خێرو پاداشتی زیاترە · لەوکەسەی زوو نوێژێکی بەتەنیادەکاله پاشان دەخەوی · ئنجا واپەسندە وەکوو بانگدەر لە بانگدان بۆوە · زووقامەت نەکا · هەتا ئەهلی جەماعەت کۆدەبنەوە · بۆخاتری هەموویان ئەم خێرەیان بگاتێ بەسەبەب چاوەڕێ کردن · بەدیارکەوت لەم حەدیثە · چلۆن دووربوونی جێگا کاردەکاتەسەر زیادبوونی خێر · دووری کاتیش کاردەکاتەسەر ئەم خێرە چونکی زەحمەتی و ناخۆشی هەم لەدووری جێگایەو هەم لەزۆر چاوەڕێ کردنە ·

٢١٩ ـ عن أبي هريرة (رض) ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم · قال بينما رجل يمشي بطريق وجد غصن شوك · على الطريق فأخره فشكر الله له فغفر له · ثم قال الشهداء خمسة ·
المطعون والمبطون والغريق وصاحب الهدم والشهيد في سبيل الله · وباقي الحديث تقدم ·

( تەرجـــەمە )

٢١٩ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە - ڕەزای خودای لێ بێ - ئوتی بەحەقیقەت پێغەمبەر (د) • گوتی کاتێك پیاوێك بەڕێگایەك دا دەڕۆیشت لکە درکێکی لەسەرڕێگا چاوپێ کەوت • لای برد لـەسـەر ڕێگـایەکە • خودای کەورە کاروکۆششەکەی ئەوی پەسندکرد • وەلێی خۆش بوو • پاشـان فەرمووی • پێنج کەس شـەهیدن • ئەوی بەطاعون دەمرێ وە بەدەردی زگ وەبەنقوم بوون وەبەبن دیوارکـەوتن و بەبن خانوو کەوتن و شـەهید لەشـەڕی کافـران • باقی حـەدیشیش لەمەپێش ڕابووردا نووسرایەوە •

٢٢٠ عـن أنس رضي اللـه تعالى عنـه • قـال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • خطابا لبني سلمة الا تحتسبون آثاركم •

( تەرجـــەمە )

٢٢٠ دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خـودای لێ بێ بـەنی سەلەمە کەطائفەیەك بوون لەمەدینەی پیرۆز مالیان لەمزگەوت دووربوو • ئیرادەیان کـرد مالیان بگوزنەوە بۆئەوەی لەمزگـەوت نزیك بن وە لەپێغەمبـەر بەنزیك بکەون و • پێغەمبەریش پێی خۆش نـەبوو • ناوشـاری مەدینـە چۆل بێ • فەرمووی ئەدی ئێوە • هەنگاوەکانی خۆتان حسـاب ناکەن • کەبەهەر هەنگاوێك • دەرەجەیەکتان هەیە • لای هەندێ موفەسیرەکان [ ونكتب ما قدموا آثارهم ] • دەرحەق بەم ڕووداوە هاتەخوارێ •

٢٢١ عن أبي هريرة (رض) قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم · ليس صلاة أثقل على المنافقين من الفجر والعشاء · ولو يعلمون لاتوهما ولو حبواً ·

( تەرجەمە )

٢٢١ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە – ڕەزای خودای لێبێ گوتی فەرمووی پێغەمبەری خودا هیچ نوێژێك گرانترنییە لەسەر منافقان · لە نوێژی سبەینەو نوێژی عیشا · ئەگەر بیانزانیبوایە چی کەلکێکی زۆر لەم دوو نوێژەدا هەیە دەهاتنە مزگەوت · بۆئەم دوو نوێژە وە بە قوونەخشکەش بوایە ·

٢٢٢ عن أبي هريرة (رض) · عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال سبعة يظللهم الله · في ظله يوم لا ظل الا ظله : الامام العادل · وشاب نشأ في عبادة ربه ورجل قلبه معلق في المساجد ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتفرقا عليه ورجل طلبته ذات منصب وجمال فقال اني اخاف الله · ورجل تصدق · أخفى حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه · ورجل ذكر الله خالياً ففاضت عيناه ·

( تەرجەمە )

٢٢٢ دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێبێ ·

پێغەمبەر (د) · فەرمووی حەوت کەس هەن خودای گــەورە لەسێبەری عــە رشی خــۆی دەیانخاتە بەرسێبەر · لــە ڕۆژێکــدا هیچسێبەرنی‌یە · سێبەری ئەونەبێ یەکی‌یان - پاشای دادوەرو بەعەدالەت حوکم بەهەق‌بکا· دووەم :- جەوانێك هەڵکەوتبێ لەسەر پەرستن‌و عبادەتی خوای خۆی · ئالوودە نەبووبێ لەپیسی گوناهان · سێ‌یەم : پیاوێك‌دلی‌بە مزگەوتانەوە گرێ‌درابێ چوارەم : دووپیاو بۆ خودایەکتریان خۆش بوێ · کۆبوونەوەو جودا بوونەوەیان لەسەرشەوق‌و خۆشەویستی خودابێ · پێنجــەم : پیــاوێك ئافرەتێکی بەمەرتەبــەو جــوانی داوای زینــای لێ‌بکــا · بلێ من‌بێ‌گومان لەخودا وەترسم ئیشی‌واناکــەم · شەشەم : پیاوێك ئەمەنــە بــەدزی خێرو چاکەبکا هەتادەستی چــەپ بەدەستی ڕاستنــەزانی چی سەرف کردووە · حەوتەم : پیاوێك زکرو یادی خودابکا لەجێگای چــۆل ئنجابگرێ‌ئاوی بەچاوان دابێتە خوارێ ·

## ٢٢٣ عن أبي هريرة (رض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال من غدا الى المسجد وراح أعــد الله له نزله من الجنة · كلما غدا أو راح ·

( تەرجــەمە )

٢٢٣ دەگێڕنەوە لەئــەبوو هــورەیرە - ڕەزای خــودای لێ‌بی · پێغەمبەر (د) فەرمووی : هەرکەس هات‌و چۆی مزگەوتی هەبی بۆنوێژو جەماعەت خودای گــەورە شــوێن‌و خۆشی‌یــەکانی‌بەهەشتی بۆسازدەدا ئەوەندە هاتوچۆی هەبێ · یەعنی چەند دەوام‌بکا · بۆی زیاد دەکا ·

## ٢٢٤ عن عبدالله ابن بجينة (رض) قال رسول

الله صلى الله عليـــه وسلم • الصبح أربعـاً الصبح أربعـاً •

( تەرجـەمە )

٢٢٤ دەگێڕنەوە لەعبداللە کوڕی مالك کوڕی بوجەینە پێغەمبەر (د) • پیاویکی دیت لەپاش قامەت بۆ نوێژی بەیانی دووڕکعەت سونەتی دەکرد وە ئیقتدای بەئیمام نەکرد • پێغەمبەر (د) • وەکوو نوێژی تەواو کرد • فەرمووی ئەرێ تۆچوار ڕکعەت دەکەی نـوێژی سـبەینە • ئـەرێ نوێژی بەیانی چوار ڕکعەتان دەکەی ؟ • یەعنی خۆ چوار ڕکعەت نی‌یە تۆ چوارڕکعەت دەکەی ش : مەبەست لەم حەدیثە نەهیە لە لەدەست پێ کردن بە ( نافلە ) • لەپاش قامەت • چونکی ئەبێ بەدوو نوێژ • هیچ‌شك نی‌یە تەفەروغ بۆئەدای فەرز لەپاش دەست پێ‌کردنی ئیمام لەخەریك بوون بە ( نافلە ) باشترە چونکە فەضیلەت‌و گەورەیی ئیحرام لەگـەل ئیمام لەکیس دەدا • ئنجا اختلاف ڕووی داوە لەنافلەی نوێژی سبەینە لەکاتی قامەت • لای حەنەفیەکان گوتویانە قەی‌نـاکا • ئەگەر لەخـارجی مزگەوت بیکاویەقینیش بکا دەگاتە ڕکعەتی دوایی لەگەل ئیمام • ئیمامی شافعی‌و ئەحمەدو غەیری ئـــەوان گوتویانە مـەکرووهە ئیمامی مالکیـش گووتوویەتی بەقەطعی مەمنوعە ( واتە ببڕای‌ببڕای قەدەغەیە ) •

حەتا ئەگەر دەستی‌بەسونەت یابەفەرزەکی‌دی‌کردبێ ئەگەر نەگاتە ڕکعەتی یەکەم • دەبێ ئەو نوێژە ببڕی لازمە ئیقتدا بەئیمام •

٢٢٥ عن عائشة رضي الله تعالى عنها • قـال رسول الله صلى الله تعـالى عليـــه وسلم • مروا ابا

بكر • فليصل بالناس مروا ابا بكر فليصل بالناس•
انكن صواحب يوسف مروا ابا بكر فليصل بالناس•
وفي رواية مه انكن لانتن •

( تەرجـەمە )

٢٢٥ دەگێڕنەوە لـەدایکی ئیمانداران حەزرەتی عائشـە ڕەزای
خودای خودای لێ بێ • پێغەمبەری خـودا (د) وەکوو ناساغ کـەوت
کەپێی وەفاتی‌کرد ئنجا نوێژبوو بانگدرا • فەرمووی ئەمربە ئەبووبکر
بکـەن ببیتە ئیمام بۆخـەلکی پێی گوترا ئەبووبەکر غەمناکەدلی :
چاوی‌بەگریانە ناتوانی ئیمامەتی بکا • دووبارە ئەم‌فەرموودەی دووبارە
کردەوە • دووبارە عەیدی جەواب لەئائشەوە پێی گوتراوە • جـاری
سێیەم • فەرموودەی دووبارە کردەوە • فەرمووشی ئەی عائشـە ئێوە
وەکوو ڕەفیقەکانی یووسـفن کەزولەیخـایە • وابیشـان دەدەن ئـەوەی
کەلەدلیان نی‌یە • چونکی زولەیخا وادیاربوو بۆ دەعوەت‌و بانگ‌کـردن
ئافرەتانی بانگ کردبوو • بەلام مەبەستی ئەوەبوو تەماشـای یوسـف
بکەن هەتا عوزری قبوول‌بکەن • حەزرەتی عائشەش بەظاهر دەی‌فەرموو
ئەبووبکر لەبەر گریان پێی‌ناکـرێ دەنگی خۆی‌بگەیەنیتە نوێژکەران •
بەلام لەباطن مەبەستی ئەوەبوو نەوەك خـەلکی غەمنـاك ببن • دلی‌یان
پێ‌توندبی بەلام پێغەمبەر وازی لەفکـری خـۆی هەرنەهێنـا • جـاری
چوارەمیش فەرمووی ئەمربە ابوبکربکەن • پێش‌نوێژی بۆخەلکی بکات •
ئنجـا ئەبووبەکر دبۆنوێژ چووەمزگەرت پێغەمبەریـش (د) فەرمـووی :
هەندێ هەستی بەلەش سووکی کـرد • بۆمزگـەوت ڕۆیشـت لـەبەینی
حەزرەتی عەلی‌و عەباسی دەڕۆیشت • عائشەفەرمووی خۆم دیتم قاچەکانی

پیرۆزی لەبەر نەخۆشی • لەسەر عەرد دەخشا • ئنجائەبووبەکر ئیرادەی کرد بکشیتەوە • پاشان بەئیشارەت پێی گوت لەجێگای خۆت بە • پاشان تەشریفی هات لەتەك ئەبووبەکر دانیشت • بووبەئیمام بۆ ئەوەی دەنگی پێغەمبەر بگاتە ئەو خەلکەی دانیشتووە ئەبووبەکر بوو بەمترجم • لەریوایەتێکی تریش عائشە بەحەفصەی گوت تۆ عەرزی بکە ئەمربفەرموی عومەر پێش نوێژی بکا • ئنجاحەفصە عەرزی کرد پێغەمبەریش فەرمووی وسکت بە بەراستی ئێوە هەوالانی یووسفن •

## ٢٢٦ عن أنس (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم اذا قدم العشاء • فابدءوا بـه • قبل ان تصلوا صلاة المغرب • ولا تعجلوا عن عشائكم •

( تەرجـەمە )

٢٢٦ دەگێرنەوە لە ئەنەس رەزای خودای لێبی پێغەمبەر (د) فەرمووی • وەکوو خواردنی ئێوارە داندرا • دەست بەخواردن بکەن ، لەپێش نوێژی مەغریب • پەلەش مەکەن لەخواردنەکەشی : ئەم حەدیثە دەلیلەو بەلگەیە لەسەر پێش خستنی ملکەچی لەنوێژ لەسەر گەورەیی ئەوەلی کاتی نوێژ •

## ٢٢٧ عن سهل ابن سعد الساعدي (رض) قال رسول الله (ص) : يا ابا بكـر ما منعك ان تثبت اذ امرتك ما لي رأيتكم اكثرتم التصـفيق • من رابـه شيء في صلاته • فليسبح • فانه اذا سبح التفت اليه وانما التصفيق للنساء •

( تەرجەمە )

٢٢٧ دەگێڕنەوە لەسەهلی کوڕی سعدی ساعدی ڕەزای خوای لێ بێ ٠ کەپێغەمبەر (د) چووبوو بۆ ناو بەنی عەمری کوڕی عەوف ٠ صولحێکیان لەبەینی بکا ٠ کاتی نوێژیش هات ٠ بانگدەریش عەرزی ئەبووبکری کرد ٠ تۆ ئیمامەتی دەکەی ٠ قامەت بکەم ٠ گوتی دەکەم ٠ ئنجا ئەبووبکر نوێژی دابەست ٠ پێغەمبەریش تەشریفی هاتەوە خەلکیش لەنوێژدابوون ٠ ڕیزەکانی دڕی هەتا چووە صەفی پێشەوە ٠ نوێژکەرەکان چەپلەیان لێدا ٠ ئاوڕی داوە ٠ چاوی بەپێغەمبەرکەوت پێغەمبەر ئیشارەی بۆ فەرموو لەجێگای خۆت بە دەوام بکە ٠ ئنجا وەکوو ئەبووبەکر ئەم ئەمرەی لەپێغەمبەر گوێ لێبوو ٠ دوو دەستی خۆی بلندکردو سوپاس وستایش خوای کرد ٠ چونکی ئەمرەکەی بۆئەبووبەکر مایەی گەورەیی بوو بۆئەو لەدینی ٠ پاشان ابوبکر بێ ئەوەی پشت لە قیبلە بکا کشایەوە پاش ٠ لەجێگەی ئیمامە هەتا هاتە ڕیز ٠ پێغەمبەریش (د) پێش کەوت پێش نوێژی کرد ٠ وەکوو سەلامی دایەوە ٠ فەرمووی ئەی ئەبووبەکر بۆچی ٠ بەئەمری من لەجێگای خۆت دەوامت نەکرد ٠ گوتی نەهاتووە بۆ کوڕی – ابن ابی قوحافە – نوێژلەپێش پێغەمبەری خودا بکا ٠ پاشان فەرمووی دیتم زۆر چەپلەتان لێدا ٠ ئەگەر کەسێك شتێکی وای ناکاوی ڕووی دا ناچار بوو بەئیشارەت ٠ بابلێ سبحان الله ٠ چونکی وەکوو تەسبیحی کرد ٠ سرنجی خەلکی ڕادەکێشێ و ئاوڕی لێ دەدرێتەوە چەپلە هەربۆ ئافرەتانە ٠

## ٢٢٨ عن عائشة رضي الله عنها ٠ قالت لما ثقل النبي (ص) قال : أصلى الناس ٠ قلنا لا يا رسول الله

هم ينتظرونك فقال ضعوا لي ماءاً في المخضب ٠

( تەرجـەمە )

٢٢٨ دەگێرنەوە لە حەزرەتی عائشـــە ـ ڕەزای خودای لێ بێ ٠ گوتی وەکوو پێغەمبەر (د) ٠ نەساغی گرانبوو فەرمووی ئەرێ خـــەلکی نوێژیان کرد ٠ گوتمان نا یا رسول الله چاوەدێری تۆدەکەن ٠ فەرمووی ئینجانەم بۆ بینن ٠ بەئاوی سارد خۆم بشۆم بەلکی نەختی ســووکم دەکات بۆنوێژدەچم ٠ ئێمەش لەسەرفەرموودەی ئەو چلۆن ئەمری کرد وامان کرد خۆی شوشت ٠ کەوتە بێهۆشی ٠ چوار جـــار بەم نەوعە ئــەم سـؤالەی دەفەرموو ٠ ئێمەش ئەو جوابەمان دەداوە ٠ وەخـۆی دەشووشت ٠ وە دەکەوتەوە بێهۆشی جاری چوارەم ٠ فەرمووی بە ابوبکر بلێن نوێژ بـۆ خەلکی بکا ( ئەم ڕووداوە لەنوێژی عیشابوو پێی نەکرا بۆ نوێژ بچی ٠ بەلام بۆ سبەینێ ٠ لەنوێژی نیوەڕۆ لەپاش خۆشووشتن نەختی سووک بوو تەشریفی فەرموو بۆ مزگەوت هەروەکوولەمەپێش بەیان کرا ٠

٢٢٩ عن أبي هريرة (رض) ٠ عـــن النبي صلى الله تعالى عليـــه وسلم قـــال أما يخشى احدكم أو ألا يخشى احدكم اذا رفع رأسه قبل الامام ان يجعل الله رأسه رأس حمار او يجعل الله صورته صورة حمار ٠

( تەرجـەمە )

٢٢٩ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە ٠ ڕەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر (د) فەرمووی ٠ ئەرێ ناترسێ یەکێکتان وەکوولەپێش ئیمام سەری خۆی

ڕاست بکاتەوە کەخـودا سەری بکا بەسەری کەر یاخۆ خـودا شکلی بکا بەشکلی کەر

(ش) لەمەزهەبی حەنەفی کەسێك لەپێش ئیمام سەری خۆی ڕاست بکاتەوە دەبێتە مخالف لەگـەل ئیمام نوێژەکـەی بەتالە لەمەزهەبی شافعیش نوێژە کەی ڕاستیش بێ گوناهکار دەبێ لەمەزهەبی حەنەفی زیاد لەمە کەنابێ لەپێش ئیمام سەری بلندبکا بـەلام لەمەزهەبی شافعی بۆ تەواوکردنی خوێندنی خۆی ئەگەر یەك دوو ڕوکنیش پاش کەوێ زەرەر نی یە

## ٢٣٠ عن أنس (رض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال اسمعوا واطيعوا وان استعمل عليكم حبشي كان رأسه زبيبة ٠

( تەرجـەمە )

٢٣٠ دەگێرنەوە لەئەنەس ــ ڕەزای خودای لێبێ پێغەمبەر (د) فەرمووی گوێبدەنە فەرمانی صاحب ئەمرتان لەهـەموو ئەمرو نەهی مەشروع کەدروست بێ بەقسەی بکەن با تەعینیش کرابێ لەسەرتان قولەڕەشێك سەری وەکـوو مێوژبێ ( لەڕەشـیولەکورتی ) یـەعنی پێتان عەیب نەبێ کـەبە جەماعەت نوێژی لەپاش بکـەن ، وە چاوەدێری کاروبارتان بکا

## ٢٣١ عـن أبي هريرة (رض) ان رسـول الله صلى الله تعالى عليـه وسلم قـال يعملون لكـم فأن أصابوا فلكم ولهم ٠ وان اخطئوا فلكم وعليهم ٠

( تەرجـەمە )

٢٣١ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە رەزای خودای لێ‌بێ • بەڕاستی پێغەمبەری خودا (د) • فەرموی ئـەم ئیمامانە بەئیمامەتی نوێژ بۆئێوە دەکەن ئەگەر نوێژەکەیان بەگوێرەی ئەو نەریتە بوو کەئاینی ئیســـلام داینـاوە • پاداشتو چاکە بۆ ئێوەشە بۆئەوانیشە • وە ئەگــەر لـە نوێژەکەشیان هەڵەیەك بکەن دیسان پاداشتی نوێژ بۆئێوە هەیە گوناەو تۆڵە ( عقاب ) عائد بەئیمامانە •

(ش) ئەم حەدیثە پیرۆزە دەلیلی ئیمامی شافعی‌یە کەگوتیتی لەپاش نوێژ ئەگەر مەعلووم بوو کەئیمام بێ‌دەستنوێژ بووە یاخۆ قالبی‌پیس‌بووە پێویست ناکا ئەهلی جەماعەت نوێژەکەیان دووبارە بکەنەوە • بەلام لای ئیمامی ئەعزەم • بەهەر حالێك نوێژی نوێژکەران بەستراوە بـــەنوێژی ئیمـــام لەدروستی‌و نادروستی کـــەوایە لەصورەتی نادروستی دەبێ نوێژکەریش وەکوو ئیمام نوێژیان دووبارە بکەنەوە •

٢٣٢ عن جابر ابـن عبدالله ( رض ) قـال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم لمعاذ ابن جبل • لمـا صلى بالناس العشاء فقرأ بالبقرة • فتان فتان فتان ثلاث مرات • أو قال فاتناً فاتناً فاتناً وأمره بسورتين من اوسط المفصل •

( تەرجـەمە )

٢٣٢ دەگێرنەوە لەجابر کوری عبدالله ـ رەزای خودایان لێ‌بێ •

مەعاذی کوڕی جەبەل نوێژی لەگەل پێغەمبەر دەکرد لەپاشان دەچۆوە دەبووە ئیمام بۆقەومەکەشی

ئنجـا نوێژی عیشای کرد سورەتی ( بقـرة )ی تیأخوێند پیاوێك لەنێو جەماعەت نیـەتی جودابوونـەوەی هێنـا تەنیـا نوێژی خۆی کرد ئەم خەبەرە گەیشتە فەخری عالەم (د) فەرمووی ئەی مەعاذ تۆ خەلکی لـە جـەماعەت دەرەوێنیەوە سێجار ئەمری پێ کـرد دووسـوورەت لەناوەنجیـەکانی ( مفصلي ) قورئان کـەلەسورەی حوجوراتەوەیە هـەتا ئاخـری ( دوایی ) لای ڕاستترین را بۆیە ( مفصل )ی پێ دەلێن چونکی لەبەر زۆری ئایاتو سوورەتەکانی فصولی زۆرە «ش» : وەرگیراوە لەم حەدیثە پیرۆزە ڕاستە اقتدای ( مفترض ) بە ( متنقل ) چونکی مەعاذ نوێژی فەرزی لەگەل پێغەمبەر دەکرد نوێژی پاشووی لەگەل قەومەکـەی سونەت بوو لـەم حەدیثـەش وەرگیـراوە کەدەبێ نوێژ بەسووکی بکرێ لەبـەر ڕاچاو کردنی حالی نوێژکەرەکان هەروەکوو لە ( شعبیبەیهەقیش ) بەئیسنادێکی ڕاست لـەحەزرەتی عمر ڕیوایەت کراوە پێغەمبەر (د) فەرمووی ( لا تبغضوا الله الی عباده یکون احدکم اماما فیطول علی القوم حتی یبغض الیهم ما هم فیه ) یەعنی خودا مەکێرن بە مەبغوض ڕك لێبووەی بەندەکانی خۆی تەکێکیان دەبێتە ئیمام ئەمەندەی نوێژەکە درێژ دەکاتەوە ڕکی لەنوێژەکە دەبێتەوە کەئەویش خودا ئەمری پێکردیە نابی تەرك بکـرێ ڕك لێبوونەوەی لەنوێژەکە دەبیتە هۆی ڕك لێ بوونەوەی لەخوداش

٢٣٣ عن أبي مسعود (رض) قـال رسول الله صلى الله عليه وسلم ان منكم منفرين فأيكم ما صلى

بالناس فليتجوز فـان فيهـم الضعيف والكبير وذا الحاجة

( تەرجـەمە )

٢٣٣ لە ئەبیمەسعود ریوایەت کراوە - ڕەزای خودای لێ بی پیاوێك هات ووتی واللە یا رسول اللە من خۆم پاش دەخەم لەجەماعـەتی بەیانی لەبەر فلان ئیمام نوێژ زۆر درێژدەکاتەوە ئنجا نەمدی لەهیـچ وەعزێك پێغـەمبەر (د) ئەمەندە ڕقی بووبیتەوە پاشـان فەرمووی بەڕاستی لەئێوەدا هەیە خەلکی لەنوێژی جەماعەت بێزار دەکـەن ئنجا هەرکامێکتان ئیمامەتی بۆ خەلکی کرد بـەبێ پازدانی هیـچ روکنێك لەنوێژ یەسبوك بیکا چونکی بەڕاستی خەلکی واهەیە بێ تاقەتە زەبوونە هەیە ئیختیارە هەمیشە خاوەنی ئیش و کارە

٢٣٤ عن جابر (رض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم في حديث معاذ الذي سبق يا معاذ فلولا صليت بسبح اسـم ربـك الأعـلى والشمس وضحاها والليـل اذا يغشى فانه يصلي وراءك الكبير والضعيف وذو الحاجة .

( تەرجـەمە )

٢٣٤ دەگێڕنەوە لەجابر ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەری خودا فەرمووی (د) لەحەدیثی جابر کەسێجار بەزەجر ( واتە ڕك لێبوونەوە ) پێی گوت (ڕفتان) لەپێش حەدیثی ابیمسعود ئـەی مەعاذ بۆچی نوێژی سبەینەت بەسوورەتەکانی وەکـو سبح اسـم ربك الاعلى

والشمس وضحاها · والليل اذا يغشى نەكرد چونكى پياو هەيە اختيارە پياو هەيە زەعيفە پياوهەيە صاحێب ئيشوكارە · نوێژت لە دوا دەكەن ·

٢٣٥ عن أبي قتادة (رض) · قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم · اني لاقوم في الصلوة · اريد أن اطول فيها · فاسمع بكاء الصبي · فاتجوز في صلاتي كراهيه ان أشق على امه ·

( تەرجەمە )

٢٣٥ دەگێڕنەوە لەئەبوو قەتادە ــ ڕەزای خودای لێ‌بی · پێغەمبەر (د) فەرمووی · بەڕاستی من هەندێ جار بەئارەزووی درێژكردنەوەی خوێندنی قورئان دەستم بەنوێژ دەكرد پاشان گوێم لەدەنگی منالی ئەو ئافرەتانە دەبوو · كە بۆ جەماعەت هاتبوونە مزگەوت نوێژەكەی خۆم سووك دەكرد · چونكی‌پێم ناخۆش بوو · مشەوەشی‌و زەحمەتی‌یەك بخەمە سەردایكی لەبەر گریانی منالەكە ·

٢٣٦ عن النعمان ابن بشير (رض) · قال : قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم · لتسون صفوفكم · أو ليخالفن الله بين وجوهكم ·

( تەرجەمە )

٢٣٦ دەگێڕنەوە لەنەعمانی كوڕی بەشیر ــ ڕەزای خودای لێ‌بی · گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی · قەسەم بەخودا · یاخۆ دەبێ لەنوێژی جەماعەت · صەفوڕیزی خۆتان ڕاستبكەن بەڕاست ڕاوەستانو كەلەن

پڕ گرد‌نه‌وه یاخۆ خوڤا تووڕه‌یی‌و عه‌داوه‌ت‌و به‌ربه‌ره‌کانێ ده‌خاته به‌ینی ئێوه ٠

ش : ڕاست ڕاوه‌ستان له‌جه‌ماعه‌ت لای حه‌نه‌فی وشافعی‌ومالکی سونه‌ته ٠ ئه‌م حه‌دیثه پیرۆزه بۆ ترسـاندنه ٠ ( ابن‌حه‌زم ) له‌به‌ر کارکردنی به‌ظاهری ئه‌م‌حه‌دیثه گوتیێ ته‌سویه واجبه ٠ ( واته پێویسته ریزه‌کان له‌نوێژ ڕاست ڕابوه‌ستن ) ٠

## ٢٣٧ عن أنس (رض) ان النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال آقيموا صفوفكم وتراصوا ٠ فاني اراكم من وراء ظهري ٠

( ته‌رجه‌مه )

٢٣٧ ده‌گێڕنه‌وه له‌ئه‌نه‌س ڕه‌زای خـودای لێ‌بی ٠ به‌ڕاسـتی پێغه‌مبه‌ر (د) ٠ فه‌رمووی ته‌سویه‌ی ڕێزی جه‌ماعه‌تی خۆتان بکه‌ن وه له‌ڕاوه‌ستان ته‌نیشتتان به‌یه‌کتره‌وه بنووسێنن چونکی من ٠ ئێوه ده‌بینم له‌لای پشته‌وه‌م ٠ ئنجا نه‌که‌ن به‌گوێم نه‌که‌ن گومان ببه‌ن که‌ناتان بینم ٠

(ش) دیتنی پێغه‌مبـه‌ر له‌لای پێشـه‌وه‌و پاشـه‌وه ڕاسـت‌بوو ٠ هـه‌روه‌کوو ته‌عبیری فـه‌رمووه به ( من ابتدائیـة ) ٠ کـه‌موشعیره به‌مه‌بده‌ئێکی دیتنیشی ـ له‌لای پشـته‌وه بـوو ٠ به‌هـه‌بوونی دووچـاوی بچووك وه‌کوو کونی ده‌رزی له‌به‌ینی دووشانی مباره‌کی شمه‌ك نه‌ده‌بووه مانعی دیتن ٠

## ٢٣٨ عن عائشة رضي الله تعالى عنها ٠ قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ اني خشيت ان تكتب عليكم صلاة الليل ٠

( تەرجەمە )

٢٣٨ دەگێڕنەوە لەدایکی ئیمانداران حەزرەتی عائشە ـ ڕەزای خودای لێبی ـ کوتی پێغەمبەر (د) • شەوی یەکەمی ڕەمەزان • بو تەراویح تەشریفی هاتە مزگەوت • هەندێ لەهاوڕێیانی بەڕێزی بەجەماعەت لەدو ئەو نوێژیان کرد تەراویحیان بەجەماعەت کرد • شەوی دووەم یاخۆ شەوی سێیەم بوو • پێغەمبەری گەورە (د) بۆ تەراویح هیچی تر تەشریفی نەهاتە دەرێ • هاوڕێیانی عەرزیان کرد ئیمشەو بۆ نوێژی شەو ـ یەعنی بۆ تەراویح ـ بۆچی تەشریفت نەهاتە مزگەوت ـ ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی بەڕاستی ترسم لێ پەیدابوو ـ لەقەلەبالغی ئێوەو هەوەستان بۆ جەماعەتی تەراویح • کەلەسەرتان بەفەرز بنووسرێ نوێژی شەو کەتەراویحە • بەلام لەپاش زەمانی پێغەمبەر چونکی ئەو ترسە نەما • لەزەمانی حەزرەتی عومەرەوە • تەراویح بەجەماعەت لەمزگەوتان جێگیربوو • ئیمامەکانی مجتهدیش زۆر باش پەسندیان کردووە •

٢٣٩ وفي هذا الحديث من رواية زيد ابن ثابت (رض) زيادة انه قال صلى الله تعالى عليه وسلم قد عرفت الذي رأيت من ضيعكم • فصلوا ايها الناس في بيوتكم • فان افضل الصلوة صلاة المرء في بيته •

( تەرجەمە )

٢٣٩ زیاد لەسەر حەدیثی پێشوو زەیدی کوڕی ثابت دەگێڕیتەوە کەبەڕاستی پێغەمبەر (د) • فەرمووی بەڕاستی منهەستم کرد لەئێوە ئەو پێخۆش بوونو قەلەبالغیو هەوەسی کەلەئێوە چاوم پێکەوت • ئنجا بۆئێوە

وا باشه ٠ سوننه‌تو ( نافله ) كانتان له‌خانوه‌كانتان بكـــه‌ن ٠ چونكى گه‌وره‌ترینى نوێژى‌سوننه‌ت نوێژى پیاوه له‌مالى خۆى كه‌بیكا به‌لام نوێژى فه‌رز كردنى له‌مزگه‌وت باشتره ٠

٢٤٠ عــن أبي هــريرة (رض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ اقول اللهم باعــد بيني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب ٠ اللهم نقني من الخطايا كما ينقى الثوب الابيض من الدنس اللهم اغسل خطاياي بالماء والثلج والبرد ٠

( ته‌رجـه‌مه )

٢٤٠ ده‌گێرنه‌وه له‌ئه‌بوو هوره‌یـره ـ ره‌زای خــوداى‌لێ‌بى گــوتى پێغه‌مبه‌ر (د) وه‌كوو نوێژى داده‌به‌ست لـــه‌به‌ینى ته‌كبیرى ته‌حــرومو خوێندنى فاتیحه‌و ٠ هــه‌ندێك كرده‌بــوو ٠ عه‌رزم كرد باوكو دایكم بـــه قوربانت بێ ئه‌ى پێغه‌مبه‌رى خودا له‌م كربوونه‌دا چى‌ده‌لێى ٠ فه‌رمووى ئه‌م دوعایه ده‌خوێنم ( اللهم باعد ) واته ئه‌ى خودایه من دووربخــه‌ره‌وه له‌گوناهه‌كانم هه‌روه‌كوو دوورخستنه‌وه‌ى رۆژهه‌لات له‌رۆژئاوا ٠ پاكـم بكه‌وه له‌گوناهان هه‌روه‌كوو پاك كردنه‌وه‌ى جلكى‌سپى له‌قرێژو پیسى ٠ خودایه گوناهه‌كانم بشۆوه به ئاوو به به‌فرو به‌ته‌زره ٠

ش : له‌دوعایه باشه‌كان هه‌ركامیان بخوێنى باشه به‌لام ئیمـــامى ئه‌عزه‌م ئه‌و دوعایه‌ى كه‌له په‌رتووكه‌كانى حه‌دیثى هه‌لبژاردووه ٠ وه ترمذى له ئه‌بووســه‌عیدى خـــودرى نووسیتى‌یه‌وه له‌كتێبى خـــۆى ٠ كه‌پێغه‌مبه‌ر له‌سه‌ره‌تا گوتویه‌تى ٠ ( سبحانك اللهم وبحمدك ٠ وتبـارك اسمك وتعالى جدك ولا اله غيرك ٠ له‌پاش ئه‌مه‌ش ئه‌گه‌ر دوعاى ( وجهت

وجهي ... هتد ) . بخوێنرێ ســـونەتە . چونکی لەصەحیحی مسلم لەحەزرەتی علی سەلامی خوای لێ بێ ڕیوایەتی کردووە ئیمامی شافعیش ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەوەی هەلبژاردووە . بەلام لـەپاش ئەمەش ئەگەر زیاد لەسەر ئەوانی تر دوعای ( سبحانك اللهم بخوێنرێ پەسندکراوە .

٢٤١ عن أسماء بنت ابي بكر رضي الله عنهما قالت قال النبي صلى الله عليه وسلم . قد دنت مني الجنـــة حتى لو اجترأت عليهـــا لجئتكم . بقطاف من قطافها ودنت مني النار حتى قلت أي رب أو انا معهم فاذا امرأة تخدشها هـــرة قلت ما شـــأن هـــذه قالوا حبستها حتى ماتت جوعا . لا أطعمتها . ولا أرسلتها تأكل من خشيش . او خشاش الارض .

( تەرجـــەمە )

٢٤١ دەگێرنەوە لەئەسمانی کچی ئەبووبەکر - ڕەزای خودای لێ بێ . گوتی فەرمووی پێغەمبەر (د) . لەپاش حەدیثی کسوف کەڕەت بوو . بەبێ شك وگومان بەهەشت لەمن نزیك خرا . بە ئەندازەیەك ئەگەر جەسارەتم بکردایە چونکە لەخوداوە ئیزنم پێ نەبوو . خواردنی بەهەشت بۆ دونیابینم . چەند ووشوو ترێیەکم لەووشوەکان بۆ دەهینان . وەلێشم نزیك خرا . ئاگر بەئەندازەیەك نزیك بوو لەمن هەتا ووتم ئەی بەخێوکەری من ئەرێ منیش لەگەل ئەواندام . باشـــان لەناکاو دیتم پشـــــیلەیەك بەڕنۆکەکانی ئافرەتێکی هەردەپچڕییەوە . گوتم بۆچی ئەم پشیلەیە ئەم ئافرەتە دەپچڕێتەوە . گوتیان ئەمە ئەو پشـیلەی بـەند کردووە هیـچی

ئەداوەتێ بەریشی نـەداوە · لەجانەوەر شتێك بـخوا هــەتا لەبرسـان مردووە ·

٢٤٢ عن آنس ابن مالك (رض) قـال · قـال رسول الله صلى الله عليـه وسـلم · ما بال أقـوام يرفعون ابصارهم الى السـماء في صلاتهم لينتهن · أو لتخطفن ابصارهم ·

( تەرجـەمە )

٢٤٢ دەگێڕنەوە لەئەنـەس كوڕی‌مـالك ـ ڕەزای خـــودای لێ‌بی گوتی پێغەمبـەر فەرمـووی (د) چـی ئەحوالێكیان هــەیە ئەو قەومانەی لەنوێژ چاویان بۆئاسمان بلند دەكـەن قەسەم بەخودا · یاخۆ واز لــەم حالەدێنن یاڕۆناكی چاوەكانیان دەڕفێنرێ هیچ نابینن ·

ش : لە نوێژ سونەتە تەماشای جێی سەجدە بكرێ لەنوێژدا · مەكرووهە ـ پەسندنی‌یە ـ تەماشای ئاسمان بكرێ · نوێژ بەتاڵ ناكا لای ابن‌حزم نەبێ · هەموو زاناكانی حەدیث لەسەر ئەوەن ئەم حەدیثە بۆترساندنە بۆیێ نوێژ بەتاڵ ناكا بەلكی پەسندنی‌یە ·

٢٤٣ عن عائشة (رض) قالت قال رسول الله صلى الله تعالى عليـه وسلم · هـو اختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد ·

( تەرجـەمە )

٢٤٣ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ( ڕەزای خودای لێ‌بی گوتی

پرسیارم کرد لەپێغەمبەر (د) • دەربارەی ئاووڕدانەوە لەنوێژ • ڕفاندنێکی بەدزییە کە شەیتان ئەم ڕفاندنە دەخاتە کار لەنوێژی بەندە ( عەبد ) •
ش : وازاندرا لەم حەدیثە ئەگەر ئاووڕ دانەوە تەنیا بەسەربێ یاخۆ بەچاوبێ وەکوو ئێرە • ئەمە ( اختلاسە ) نوێژ بەتاڵ ناکا • بەمەرجێك لەبەر پێویستییەك بێ • بەگاڵتە نەبێ • بەلام سنگی لەلای قیبلە لابرد • نوێژەکە بە تەواوی بەتاڵە • یەعنی چی بە ضرورة ( پێویستی ) چی بەگاڵتە •

## ٢٤٤ عن عبــادة بن الصامت : (رض) : قــال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب •

**( تەرجــەمە )**

٢٤٤ دەگێڕنەوە لەعوبادەی کوڕی‌صامت پێغەمبەر (د) فەرمووی نوێژ بۆئەوکەسە نییە کە فاتحەی تیانــەخوێنێ • یــەعنی نوێژەکــەی نوێژ نییە • (ش) : لای‌ئیمامی ئەعزەم • ڕەحمەتی خــوای لێ‌بی ( نەفی‌و نەبوون بۆ نوێژەکە خۆی‌نییە ) • بەلکی نەفی بۆ کەمالی نوێژە • یەعنی بێ خوێندنی فاتیحە ناگەیە پلــەی تەواوی نوێژ • ئەمەش دەرحــەق بەنوێژی تەنیایە • بەلام ئەگەر مەبەستی دەرەجەی کــەمال نەبێ • اکتفا دەکرێ بۆ هەبوونی نوێژ بەخوێندنی هەرئایەتێك بێ‌لەقورئان بە دەلیلی ( فاقرءوا ما تيسر من القرآن ) وەبە دەلیلی ئەم حەدیثەش ( ثم اقــرأ ما تيسر معك من القرآن ) • بــەلام دەربارەی نوێژکەران ( مأموم ) • لەپشت ئیمام بەقەطعی فاتحەی ناخوێنی • بەدەلیلی چەند حەدیثی تر کەخوێندنی ئیمام خوێندنی ( مأموم )ە • دەبێ مەئمووم هەر قسەنەکا •

لای ئیمامی شافعیش چی ئیمـــام بێ · چی ( مەئموم ) بێ · چی نوێژی جەهری بێ · چی نوێژی سری بێ · دەبێ هەموویان لەهـــەموو نوێژێك لەهەموو رکعەتێك فاتحە بخوێنرێ · بـــە ( فەرضی ) · وە ئەگـــەر سورەتەکیش بخوێنی لەگەل فاتحە باشترە · بەلام لای ئیمامی مالك وە ئیمامی حەنبەلی لەنوێژی ( جەهری ) · لەپاش ئیمام نابی مەئموم فاتحە بخوێنی · لەنوێژی سری وخەفیش ـ واتە نوێژی کەبەدەنگ بخوێنرێ و یان بەشێوەیەکی نەبیستراو ـ خوێندنی فاتحـــە لەهـــەموو رکعـــەتان ( فەرضە ) · قسەی کۆنی شافعیش وایە · پوختـــەی قسە : لەم هەرسێ مەزهەبە بەهەمە حاڵ بۆتاکەکەس لەهەرنوێژێك لەهەر رکعەتێك ئەگەر فاتحەی پیرۆز نەخـــوێنێ · بەدەلالەتی ئاشکرای ئـــەم حەدیثە بیرۆزە نوێژەکەی نوێژ نی یە · بەلکی وەکوو نوێژی نەکردبی وایە ·

٢٤٥ عن ابي هريرة (رض) ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم دخل المسجد · فدخل رجل فصلى فسلم على النبي (ص) · وقال ـ ارجع فصل · فانك لم تصل فرجـــع يصلي كما صلى · ثم جـاء فسلم على النبي (ص) فقال ارجع فصل فانك لم تصل ثلاثا · فقــال والذي بعثك بالحق ما أحسن غيره · فعلمني فقال اذا قمت الى الصلوة فكبر · ثم اقرأ ما تيســر معك من القرآن · ثم اركع حتى تطمئن راكعا · ثم ارفع حتى تعتــدل قائمــاً · ثم اســجد حتى تطمئن ساجداً ثم ارفــع حتى تطمئن جالساً وافعــل ذلك في صلاتك كلها ·

( تەرجــەمە )

٢٤٥ دەگێڕنەوە لەئەبوو هــورەیرە – ڕەزای خــودای لێبێ ٠ کەبەڕاستی پێغەمبــەر (د) چووە مزگەوت ٠ پیاوێکیش هاتەمزگــەوت نوێژی کرد ٠ پاشان سەلامی کرد لەپێغەمبــەر (د) ٠ ڕەدی ســەلامی کردەوە – واتەسەلامی لێوەرگرتەوە – فەرمووی بگەڕێوە نوێژەکە بکەوە چونکی تۆ نوێژ نەبوو کردت : پیاوەکە لەبەر قسەی پێغەمبەر (د) گەڕاوە وەکووجاری پێشوو نوێژی کرد پاشــان هاتەوە خدمەتپێغەمبــەر (د) سەلامیکرد دووبارە فەرمووی بگەڕێوە نوێژبکە ٠ چونکی بەڕاستی تۆ نوێژنەبوو کردت ٠ تاسێ جار بەم دەستوورە ٠ باشان پیاوەکــە ووتی ٠ بەحەقی خودا کەتۆی کردووە بەپێغەمبەر ٠ لەمەباشتر نوێژ نازانم ٠ ئنجا فێرم بکە ٠ پێغەمبەر (د) فــەرمووی وەکووهەلستای بۆنوێژ ٠ بۆ تەحەرم بلێ الله اکبر پاشان ئەوەندەی پێت دەکرێ قورئان بخوێنــە ٠ لەو مقدارەی کەلەبەرتە ٠ فاتحەبێ یا غەیری فاتحەبێ ٠ پاشان داوەرەوە بۆ رکوع هەتا ساکن دەبیو قەرار دەگری لەرکوعدا پاشان ٠

ڕاست ببەوە لەرکوع هەتاڕاست ڕادەوەستی ٠ پاشان سەجدە ببە هەتاساکن دەبیو قەرار دەگری لەسەجدەدا ٠ پاشان هەلستەوە لەسەجدە هەتا قەرار دەگری لە دانیشتندا ٠ ئەمانەی پێمگوتی وابکە لــەهەموو نوێژی خۆت ٠

ش : ئەم حەدیثە دەلیلی ئیمامی ئەعزەمە لەسەر ئەوەی کەواجبنییە فاتحە خوێندن بە تایبەتی لەنوێژ ٠ وەواجبیش نییە نیەت هێنان چونکی لەم حەدیثە باسی نییەت نەکرا لەگەل پیاوەکە ٠ باسی فاتحەش نەکرا٠ وەلەلای ئیمامی شــافعیو مالکو ئەحمــەد وەلەلای ئیمــامی یوسف

لەحەنەفی ڕەحمەتی خوایان لێ بی • تەعـــدیلی ئەرکان ولەسەرە خۆیی فەڕزە • لەلای ئیمامی ئەعزەمیش واجبە • چونکی گوتیتی لبـــە حەدیث کەدەڵێ تۆ نوێژت نەکرد یەعنی نوێژی تەواوت نەکرد بـەلام هەرسێ ئیمام دەڵێن بەقەطعی نوێژەکەت دروست نەبووە چونکی ڕاچـاوی لەســـەرە خۆییت نەکردووە دەلیلی هەمووشیان ئەم حەدیثەیە •

٢٤٦ عن أبي هريرة (رض) ان النبي صلى الله عليه وسلم قال اذا أمن الامام فأمنوا • فانه من وافق تأمينه تأمين الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه •

( تەرجـــەمە )

٢٤٦ دەگێڕنەوە لەئـــەبووهوڕەیرە ـ ڕەزای خـــودای لێ بی • بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو ئیمـــام گوتی ( آمین ) ئێوەش بڵێن ( آمین ) چونکی بەبێ گومان هەرکەسێك تەئمینی موافقە بکا لەگەل تەئمینی مەلائکە مەغفرەتی پێدەکرێ لەلایەن خوداوە لە هەموو گوناهێکی کەلەپێشدان کردوویەتی ش : لای حـــەنەفی ئیمـــام بەدزی دەڵێ ئامین جەماعەتیش ئەگەر گوێیان لەئامین گوتنی ئیمـــام بووسونەتە ئەوانیش بەدزی بڵێن ( آمین ) لای شافعیش ( ئیمام ) و ( مەئموم ) • بەئاشـــکرا بە دەنگی بەرز سونەتە بڵێن ( آمین ) •

٢٤٧ عـــن أبي هريرة (رض) • ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم قال اذا قال احدكم آمين • وقالت الملائكـــة في الســــماء آمين فوافقت احداهمـــا الأخرى غفر له ما تقدم من ذنبه •

( تەرجـەمە )

٢٤٧ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە - ڕەزای خودای لێ بی - کەبێ شك پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو یەکێکتان گوتی آمین · یەعنی دوعـام قبوول بکە · مەلائکەش لەئاسمان گۆتیان آمین ئنجا هەردوو ( آمین ) یەکتربگرنەوە خودا لەوگوناهەی خۆشدەبی کەلەپێشدا کردوویەتی ·

ش : چی لەنوێژبێ چیلە دەرەوەی نوێژبێ لەپاش فاتحە · آمین - گۆتن سونەتە بەلکۆ لەهەموو دوعایەك آمین گۆتن سونەتە ·

## ٢٤٨ عن ابي بكرة (رض) انه انتهى الى النبي صلى الله تعالى عليه وسلم وهو راكع فركع قبل ان يصل الى الصف فذكر ذلك للنبي صلى الله تعالى عليه وسلم · فقال زادك الله حرصاً ولا تعد ·

( تەرجـەمە )

٢٤٨ دەگێڕنەوە لە ابو بكرة - ڕەزای خودای لێ بێ · بۆ نوێژ چووە مزگەوت · دیتی پێغەمبەر لە ركوعە لەبەر استعجال لەپێش چوونە ناوریزی جەماعەت لە پشتەوە بەتەنیا اقتدای کردو چووە رکوع پاشان ئەم حالەی خۆی - عەرزی پێغەمبەر کرد (د) فەرمووی خودای گـــەورە حیرصو ئیشتیاقت لەسەر نوێژو جەماعـەتو طاعـەت زیاد بکـــا · جارێکی‌تر اقتدانەکەی لەپێش گەیشتنی‌صەف (ش) : اقتدا کردن لەپێش دخولی صەف لەمەزهەبی شافعیو مالكو احمد مەکرووهە یەعنی جـائزە نوێژەکەی مع الكراهة · بەلام لەمەزهەبی حەنەفی · حەرامە لەپاش‌صەف بەتەنیا ·

٢٤٩ عن ابي هريرة (رض) قال كان رسول الله صلى الله تعالى عليــه وسلم يقــول الله اكبر · الله اكبر · سمع الله لمن حمده · ربنــا لك الحمد · الله اكبر · الله اكبر · الله اكبر · اللــه اكبر · اللــه اكبر · الله اكبر ·

( تەرجــەمە )

٢٤٩ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ( ڕەزای خودای لێ‌بی – گوتی پێغەمبەری خودا (د) لەقیام لەدابەستنی نوێژ · دەی‌گوت الله اکبر بۆ رکوع دەی گوت ربنـــا لك الحمـــد بوسەجدەی یەکەم · الله اکبر · بۆدانیشتن لەبەیدی دوو ( سەجدە ) · بۆسەجدەی دووەم · بۆهەستانەو لەسەجدەی دووەم ( الله اکبر ) بۆرکعەتی سێیەم الله اکبر ·

٢٥٠ عن عائشة رضي الله تعالى عنها قالت كان النبي صلى الله تعالى عليــه وسلم يقــول في ركوعه وسجوده · سبحانك اللهــم ربنــا وبحمدك اللهــم اغفر لي ·

( تەرجــەمە )

٢٥٠ دەگێڕنەوە لەئــــەبوو هورەیرە – ڕەزای‌خـــودای لێ‌بی · کەبەڕاستی پێغەمبەری خودا (د) · فەرمووی · وەکوو ئیمـــام گوتی سمع الله لمن حمده – ئێوەش بلێن ( اللهم ربنا لك الحمـد ) چونکی‌قسـەو حەمد ( سوپاس )ی هەرکەسێك ڕێك بکەوی لەگەل قســـەو سوپاسی

مەلائکە · لەهەموو گوناهێکی پێشووی دەبووردرێ ·

ش : دەلیلی ئیمامی ئەعزەم وئیمامیمالك ئەم حەدیثەیە · کەئیمام هەردەلێ · سمع الله لمن حمده · نالێ ( ربنا لك الحمد ) · جەماعەتیش دەلێن ربنا لك الحمد · نالێ سمع الله لمن حمده · لای ئەم دوو ئیمامـە · اللهم ربنا لك الحمدیش هاتووە · لەلای شافعیش بۆ ئیمام ومەئمـوم وتاك ( منفرد ) · جەمعیان سونەتە · لـەلای ئیمامی ئەحمەدیش · بۆ ئیمامو تاك جەمعیان سونەتە · بەس نەكبۆ مأموم ·

٢٥١ عن رفاعـة ابن رافع الزرقي (رض) قـال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم · من المتكلم · لقد رأيت بضعا وثلاثين ملكا · يبتدرونها · ايهم يكتبها أول ·

( تەرجـەمە )

٢٥١ دەگێڕنەوە لە ( رفاعەی ) کـوڕی ( رافع )ی زورقی · گوتی ڕۆژێك لەدوای پێغەمبەر دروودی خوایلەسەربێ نوێژمان دەکـرد وەکوو لەرکوع ( داهاتنەوە ) سەری بڵندکرد فەرمـووی ( سمع الله لمـن حمده ) · پیاویکیش لەوانەی لەپشتەوە نوێژیان دەکرد · گوتی ربنا لك الحمد حمدا کثیرا طیبا مبارکا فیه · لەپاش نوێژ پێغەمبـەر (د) · فەرمووی بەتەحقیقوبەبێ شكوگومان دیتم · سیوئـەوەندە مەلائکـە چوستیو تالووکەیان دەکرد · بۆنووسینەوەی ئەم حەمدوثەنایەکەکامەیان لەمسابقەدەردەچن پێشتر دەی نووسیتەوە ·

٢٥٢ عن أبي هريرة · قـال كـان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم حين يرفع رأسـه يقـول سمع الله لمن حمـده ربنـا لك الحمد يدعو الرجـال ويسميهم باسمائهم فيقول · اللهم أنج الوليد ابن الوليد · وسلمة ابن هشام · وعياش ابن أبي ربيعه والمستضعفين من المؤمنين اللهم أشـدد وطاتك على مضر · واجعلها عليهم سنين · كسني يوسف · غفار غفر الله لها وأسلم سالمها الله ·

( تەرجـەمە )

٢٥٢ دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بی · گوتی پێغەمبەر (د) · وەکوو سەری لەرکوع بلند دەکرد دەیگوت ( سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد · ) لەمەقامی قنوت ئەم دوعایەی دەکـرد · دەی‌گوت یارەبی ئەو ئیمـانداارانەی کەلەمەکە ـ ئەسیر ـ ماوون کەوەلیـدی کوڕی‌وەلیدی برای خـالدکوری وەلیدە · وەسـەلەمەی کوڕی هشام وە عەیاشی کوڕی رەبیعەیە · لەئەسیری کافران ڕزگاربکە · وەکوو ئەمانەش ئەوئیماندارانەی کـە هەژارن · کـەزعیفـو زەبوونن لەناوخەلکی مەکە · لەزولمی کافرانی مەکە قورتاریان بکە یاخودا عەزابـو تۆلەی خۆت توندو بەهێـزبکە لەسـەر کافرەکـانی قوڕەیش کەمنـدالانی ( مضرن ) وە عەزابەکەی خۆشت لەسەر ئەوان بکێرە بەقاتی‌وگرانی · وەکوو قاتی‌و گـرانی ( مصر ) لەزەمانی یوسف سەلامی‌خوای‌لێ‌بی · یەعنی بەلاومیحنەت لەسەر ئەران دەوام بکا بەڵکی باوەڕ دەینن · قەبیلەی

( غفار ) خودا لێیان خۆش بی • قەبیلـەی - ( ئەسلەمیش ) خـوا سەلامەتیان بکا ئەمە ئاخری قنووتی بوو •

ش : ئنجا خودا ئەم دوعایەی پێغەمبەری قبووکرد • ئـەو یرو ئەصحابانەی کەناویان گۆترا • لەئەسیری ڕزگاربوون • قاتی‌وگرانیش عاتەسەر قورەیش‌و ئەولادی موضەر مەکەی پیرۆزیش وەکوو فەتح کرا ئیمانداراتی هەژارو ناهەژار لەستەم‌و دەردەسەری کافران حەسانەوە • پاشان قـەبیلەی ( موضەریش ) بـەڕۆناکی باوەڕ ( ئیمان ) ڕۆناك بوونەوە •

٢٥٣ عن أبي هريرة ( رض ) • ان الناس قالوا يا رسول الله هل نرى ربنا يوم القيامه • قـال هل تمارون في القمر ليلة البدر ليس دونه سحاب • قالوا لا يا رسول الله قـال فهل تمارون في الشمس ليس دونها سحاب • قالوا لا يا رسول الله • قال فانكم ترونه كذلك يحشر الناس يوم القيامة • فيقول من كان يعبد شيئاً فليتبع فمنهم من يتبع الشمس ومنهم من يتبع القمر ومنهم من يتبع الطواغيت • وتبقى هذه الامة فيها منافقوها فيأتيهم الله فيقول انا ربكم فيقولون هذا مكاننا حتى يأتينا ربنا فاذا جاء ربنا عرفناه فيأتيهم الله عز وجل فيقول أنا ربكم • فيقولون انت ربنا فيدعوهم ويضرب الصراط بين ظهراني جهنم فأكون أول من يجوز من الرسل بأمتة ولا يتكلم يومئذ احد الا الرسل • وكلام الرسل يومئذ

اللهم سلم سلم · وفي جهنم كلاليب مثل شوك السعدان غير انه لا يعلم قدر عظمها الا الله · تخطف الناس بأعمالهم فمنهم من يوبق بعمله ومنهم من يخردل ثم ينجو · حتى اذا اراد الله رحمه من اراد من اهل الناس · امر الملائكة ان يخرجوا من كان يعبد الله فيخرجونهم · ويعرفونهم بآثار السجود وحرم الله على النار ان تأكل اثر السجود · فيخرجون من النار · وقد امتجشوا فيصب عليهم ماء الحياة فينبتون كما تنبت الحبة في جميل السيل ثم يفرغ الله من القضاء بين العباد · ويبقى رجل بين الجنه والنار · وهو آخر أهل النار دخولا الجنة مقبلا بوجهه قبل النار فيقول يا رب اصرف وجهي عن النار قد قشبني ريحها واحرقني ذكاؤها فيقول هل عسيت أن فعل ذلك بك ان تسئل غير ذلك فيقول لا وعزتك · فيعطي الله ما يشاء من عهد وميثاق · فيصرف الله وجهه عن النار فاذا أقبل به على الجنة رأى بهجتها · سكت ما شاء الله ان يسكت · ثم قال يا رب · قدمني عند باب الجنة فيقول الله · أليس قد اعطيت العهود والميثاق · ان لا تسئل غير الذي كنت سئلت · فيقول يا رب لا اكون أشقى خلقك فيقول ما عسيت ان اعطيت ذلك ان لا تسئل غيره فيقول لا وعزتك لا أسئل غير ذلك فيعطي ربه ما شاء من عهد ميثاق فيقدمه الى باب الجنة فاذا بلغ بابها فرأى زهرتها

وما فيها من النضرة والسرور فيسكت ما شاء الله ان
يسكت فيقول يا رب ادخلني الجنه فيقول الله عز
وجل ويحك يا ابن ادم ما أغدرك اليس قد اعطيت
العهد والميثاق وان لا تسئل غير الذي أعطيت . فيقول
يارب لا تجعلني أشقى خلقك فيضحك الله منه ثم
يأذن له في دخول الجنة . فيقول تمن فيتمنى حتى اذا
انقطع أمنيته . قال الله زد من كذا وكذا أقبل يذكره
ربه حتى اذا انتهت به الاماني قال الله تعالى لك
ذلك ومثله معه

( تەرجەمە )

٢٥٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە - رەزای خـــودای لێبێ
هەندێ لەئەصحابی کیرام بەپسیار کردن گوتیان یا رسول الله ئـەرێ
ئێمە رۆژی قیامەت خودای خۆمان دەبینین جوابی داوە فـەرمووی
ئەرێ شکتان هەیە لەدیتنی مانگی چواردەشەوی کـەئاسمان پاکیش بێ
لەهەوور گوتیان نا ئەی پێغەمبەری خـــودا فەرمووی بەڕاستی
ئێوە خودای خۆتان دەبینن بێ‌گومان وەکوو دیتنی ئەم مانگەو رۆژە عالەم
کۆ دەکرێتەوە رۆژی قیامەت ئنجا خودا دەفەرموی هەرکەسێك شـتێکی
پەرستووە لەدونیا بابکەوێتە شوێن ئەوشتە ئنجا هەیە لەخەلکی ئەکەونە
شوێن خۆر هەیە ئەکەونە شوێن مانگ وەهــەندێ لەخـەلکی دەکـەونە
شوێن - طاغوت - یەعنی هەرچی سەرکردەی رێ‌بزرکردن بێ - وەکـو
لاتو عوززاو کاهینو شەیتاو بوتەکان وە لەستەمکارانی ئینسان چونکی

هەرکەسێك بەدوای ستەمکارێکی بکەوێ لەڕێ بزرکردن ئەوا عیبادەتی ئەوی کرد • ئنجا تابع مەتبوعەکان لەبەر دەچنەدەرێ بۆ ناو جەهەنەم دەڕۆن • ئەم ئومەتی محمدیە دەمینێن کەمنافقیان لەناودا هەن ئنجا خودا دەیان هێنی‌دەفەرموێ من خودای ئێوەم لەصفەتەکی وا کەمنافقەکان نەیناسن لەبەر تاقی کردنەوەکی خودایی کەقصوریان بەدیارنەکەوی • ئەوانیش دەلێن ئێمە لەجێگەی خۆمانین نابزوین هەتا خودای خۆمان دێ • وەکوو هات ئێمە دەی ناسین • ئنجا خودا خۆیان بۆ بەدیار دەخا بەصورەتێکی وا کەبی‌ناسن • دەفەرموێ من خودای ئێوەم • دەلێن وایە تۆ خودای ئێمەی • ئنجا بانگی هەموویان دەکان هەرکەسێك بۆمەقامی خۆی پردی صیراطیش دادەندرێ لەسەر ناوەندی جەهەنەم • ئنجا من یەکەم کەسێکم لەپێغەمبەران کەبەئومەتی خۆیەوە ماوەی ئەم صراطە ببرێ • لەبەر توندی‌وترسناکی ئەم ڕۆژە هیچ کەس ناتوانێ قسەیەك بکاغەیری پێغەمبەرانی ناردراو ( مرسل ) نەبێ قسەی ناردراوانیش ئەمەندەیە دەلێن خودایا بەچاکەی خۆت سەلامەتمان بکەی سەلامەتمان بکەی‌وە جەهەنەم چەند قولابەی سەرنیژ وەکوو دڕکی زەردی سەربەتۆپی ناوبراو بەزوبانی کوردی ( مەمکەکیژانە ) • ئەرێ دڕکی مەمکە کیژانەتان دیوە گۆتیان بەلێ دە ئنجا قولابەکان وەکوو دڕکی مەمکەکیژانە وایە بەلام خودانەبێ کەسی چەندی‌یەنی گەورەیی ئەو قولابانە نازانی • گوناهکاران بەچوستی دەگرێ بەسەبەب گوناهەکانیان • ئنجاهەیە لەخەلکی بەگوناهو کردەوەی خۆی لەناودەچی وە هەیشە پارچە پارچەی دەکا کەبیخاتە ناو ئاگر پاشان ڕزگاری دەبی • هەتاو کوو خودا ئیرادە دەکا مەرحەمەتی خۆی بەو کەسەی کەویستوویەتی

رەحمی پێ بکا لە ئەهلی ئاگر ، فەرمان بە مەلائکە دەکا لە ئاگری بیهێننە
دەرێ ئەوی خوای پەرستووە لەدونیا ، ئنجا دەیان هێنە دەرێ ، بە
شوێنەواری سوجدە دەیان ناسنەوە چونکی ئاگری جەهەنەم هەموو
لەشیانی سووتاندووە ئەندامی سەجدەنەبێ خودا نەئاگری حەرام
کردووە شوێن سەجدە بۆخودا ، ئاگر هەموو ئەندامی لەشی دەخوا
دوو دەستو سەجدە دوو ئەژنۆو نێوچاوان نەبێ بۆپیاوی نوێژکەر ،
ئنجا دێنە دەرێ لەئاگر لەحالەتێك کەسووتاوون رەشدا گەڕاوون
ئنجائاوی حەیاتیان بەسەردا دەکرێ ، ئنجا شین دەبنەوە وەکووشین
بوونەوەی دانەوێلە ـ وەکوو گەنموجۆ ـ ئەوەی کەلافاو هەلی گرتووە ـ
لەنەڕوو تازەیی و زوو شین بوونەوەیان ، پاشان حوکم وقەزا بەئەوابو
عقابی عباداتەوە تەواو دەبی ،
یەك پیاو لەبەینی بەهەشتوئاگر دەمینێتەوە ئەوە ئاخری هەموو ئەهلی
ئاگرە کەبچێتە ناو بەهەشت ، لەحالەتێکدایە ڕووی کەوتۆتە لای ئاگر ،
دەلێ یارەبی ڕووم لەئاگر وەربگێرە نەی بینم بەڕاستی بێنی جەهەنەم
هەموو قالبی پڕلەژەهر کردووم ، پێستەی هەموو لەشی منی
سووتاندووە ، خودای گەورە دەفەرموێ ، ئەی بەندە من ئەگەرڕووشت
لەجەهەنەم وەربگێرم ، ئەمەل ناکرێ لەتۆ کەداوای شتێکی تریشم
لێ بکەی ، پیاوەکە دەلێ سوێند بەگەورەیی تۆ داوای هیچی تر ناکەم
خودای گەورە پەیمانی لێ وەردەگری وە ڕووی لەلای جەهەنەم
وەردەگێری ڕووی دەخاتە لای بەهەشت ، پیاوەکە چاوی بەجوانیو
خۆشی بەهەشت دەکەوێ ، کەپڕە لەنازونیعمەت ، قسەناکا ئەوەندەی
کەخودا حەزدەکا کەقسەنەکا پاشان دەلێ ئەی خودایە من بەرە لای
دەرکەی بەهەشت بکە خودای گەورە دەلێ ئەرێ تۆ پەیمانت نەدا بەمن
داوای هیچی ترم لێ نەکەی ، پیاوەکە دەلێ ئەی خودایە ، نامەوێ

خراپترین مەخلوقاتی تۆبم یەعنی ئەگەر لەدەرگەی بەهەشت نزیکم
نەخەی • خراپترینی مەخلوقی تۆم ئنجا خودا دەفەرموێ • ئەرێ لێت
ناوەشێتەوە ئەگەر ئەمەت پێبدەم داوای هیچیترم لێنەکەی دەڵێ : نا
سوێند بەگەورەیی تۆ • غەیری ئەمەندە داوای هیچیترت لێ ناکەم •
ئنجا ئەوەندی خودا حەزبکا پەیمان بەخودا دەدا وەلەدەرگەی بەهەشتی
بەنزیک دەخا • وەکوو گەیشتە دەرگەی بەهەشت چاوی بەتەڕیو
تازەیی و باغاتو دیمەنەکانی جوانی بەهەشت دەکەوی • قسە ناکا
ئەوەندەی خوداحەز بکا • پاشان دەڵێ خودایا من بەرەناو بەهەشت •
خودا دەفەرموێ ئەی کوڕی ئادەم چەند پەیمان شکێنی • ئەدی پەیمانت
بەمن نەدا داوای هیچیترم لێنەکەی غەیری ئەمەندە کەپێم دای •
ئنجادەڵێ ئەی خودایا بەچاکەی حۆت مەمگێڕە بەخراپترین مەخلوقی
خۆت • ئنجا خودای گەورە پێی پێدەکەنی ( یەعنی ڕازی بوونی خۆی
بۆ بەدیار دەخا ) • پاشان ئیزن دەدا بۆ چوونە ناو بەهەشت • ئنجا
خودای گەورە دەفەموێ ئارەزووت چیهەیە بڵێ پیاوەکە
هەرچەندئارەزوویهەیە دەڵێو پێیدەدرێ هەتاهیچ ئارەزووی نامینی
نازانی چیداوا لێبکا • خودا فێری دەکا • فلان نیعمەتم داوا لێبکەرە
فلان شتملێبخوازە هەر بەبیری دەخانەوە • هەتا ئارەرووەکانی هەموو
تەواو دەکا • خودای گەورە دەفەرموێ ئەمە هەموو بۆتۆبێ • لەگەل
ئەمەندەی تریش •

٢٥٤ عن ابن عباس (رض) قال رسول الله صلى
الله تعالى عليه وسلم • أمرت ان أسجد على سبعة
أعظم على الجبهة • واليدين والركبتين • واطراف

القدمين ولا نكفت الثياب • والشعر •

٢٥٤ دەگێرنەوە لەئوری عەباس - ڕەزای خـــودای لێبـــی • پێغەمبەر (د) • فەرمووی ئەمرم پێکراوە کەلەسەر حەوت ئەندام سەجدە بەرم لەسەر نێوچاوانو دوو دەســـتو دوو ئەژنـــۆ وەلەســـەر ئەطرافـــی پەنجەکانی دووقاچم • وە فەرمانیشم پێکراوە بەدەستەکانم گردنەکەمەوە لباسمومووی سەرم(حیکمەت ئەمەیـــە چونکـــە جلکو مـــووی سەریش مرویش سەجدە دەبەن لەگەڵنوێژکـــەر • یاخـــۆ ئەگـــەر جلکو مـــوە لێنەگەڕێ بکەوینە سەرعەرد تەشەبوە بەئەهلی تەکەبورە • ( واتەلاساى پیاوی بەدەعیە دەکاتەوە • ) •

(ش) : لای ئیمامی ئەعزەمدا انی بەشێك لەنێوچاوان لەسەر عـــەرد فەرزە • دانانی بەشیزۆری نێوجاوانیش واجبە • لای هەرسێ ئیمامیش دانانی بەشێك لەنێوچاوان لەکاتی سەجدە بەسە(کافیە) •

٢٥٥ عن انس ( ض ) قال رسول الله صلى الله تعالى عليـــه وسلم اعتدلوا في السجود • ولا يبسط احدكم ذراعية انبساط الكلب •

٢٥٥ دەگێرنەوە لەئەنەسی - ڕەزای خودای لێبی • پێغەمبەر (د) فەرمووی ســـەجدە باش ببەن باوەڵسەگ ڕانەکێشی یەکێکتان باسکەکانی خۆی لەسەر عەرد • وەکوو ڕاکێشانی سەگـــ لەوەرکەوتـــن • یەعنـــی نەزۆر بلندیان بکەن • نەلەسەر عـــەردیش ڕایـــان بخەن وەکـــوو سەگ بەلکی ڕاچاوی دەرەجەی اعتدال بکەن •

٢٥٦ عن عبد الله ابن مسعود ( رض ) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم · ان الله هو السلام فاذا صلى احد لم فليقل التحيات لله والصلوات والطيبات السلام عليك ايها النبي · ورحمه الله وبركاته السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين · فانكم اذا قلتموها أصابت كل عبد لله صالح في السماء والارض أشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا عبده ورسوله ·

٢٥٦ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێبێ · گوتی وەکوو نوێژمان لەدوای پێغەمبەر دەکرد · دەمانگوت ـ السلام علی الله السلام علی جبریل · ومیکائیل السلام علی فلان وفلان بیادەڕویشتین · پاشان پیغەمبەر(د.) · ئاوڕی لەئێمەدایەوە فەرمووی : بەڕاستی خودای گەورە ئەوە سەلام(ئاشتی) · یەعنی لەفظی سەلام ناوێکە لەناوەپیرۆزەکانی خودا · شتێکی بێمەعنایە ئێوە دەلێن ـ السلام علی الله · واتە سەلام لەسەر خودابێ · ئنجا وەکوو یەکێکتان نوێژی کرد · بێژێ التحیات لله یەعنی گەورەیی و مانەوەی هەتاهەتایە تایبەتە بەخودا · والصلوات : هەموو نوێژێك خوا پەرستنێکیش · والطیبات : هەموو جۆرە بەگەورە زانین و ( تەقدیساتێك ) · تایبەتە بەخودا · سەلامەت

:وون لەھەمــوو ئافاتو خراپــە لەسەر توبــی ئــەی پێغەمبــەدی گــەورە
کەگەورەتریــن واسطانی نەبەینــی ئەوحودایــەی کــەدەی پــەرستیــنو
بەندەکانی ٠ ( رحمةاللەوبرکاتە ) واتە میهرەبانی خوداو چاکەی خودایش
لەسەر توبی السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین ٠ سەلام لەسەرئێمەو
عەبدە باشەکانی خوداش بی ٠

پاشان پێغەمبەر فەرمووی وەکــوو ئێــوە نــەو کلماتــە بلێــن دوعــای
سوودلێوەرگیراو(مستفاد) لەم کلمانە ئەگا بەھەموو بەندە باشەکانــــی
خودا لەئاسمانو عارد (مەعنای شەھادە) ٠ اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان
محمد الرسول الله ) ٠ مەعنای بەزوبــان دەلێــم بەدلیش باوور دەکــــەم
کەھیچ خودایێکی لایقیعبادەت نییە زاتێك نەبێ کەھەمووصفاتی باشــیو
تەواوی تێدایە وە بە زوبان ئیقرار دەکەم بەدلیش باوورپدەکەم بەبێ شكو
بێ گومان کە محمد بەندەی خودایەو پێغەمبەری خودایە ٠

٢٥٧ عن عائشة ( رض ) ٠ ان رسول الله صلي الله تعالي عليه وسلم كان يدعو في الصلوة ٠ اللهم أعوذ بــك من عــذاب القبر ٠ واعوذ بــك من فتنة المسيح الدجال ٠ وأعوذ بــك من فتنة المحيا والممات اللهم اني اعوذ بك من المأثم والمغرم ٠ فقال له قائــل ما اكثر ما تستعيد من المغرم فقال ان الرجل اذا عزم حدث فكذب ووعد فاخلف ٠

٢٥٧ دەگێڕنەوە لەحـەزرەتی عائشـە دایکی ئیمانـداران - ڕەزای خودای لێ بێ - بەڕاسـتی پێغەمبەری خـودا (د) لەپاش شـەهادەت ئەم دوعایەی دەخوێند ٠ [ اللهم اعوذ بك من عذاب القبر ٠٠٠٠٠٠ الخ ] واتە ٠ ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بەتـۆ لەعەزابـی قەبـر ٠ وەخـۆم دەپارێزم بەتۆ لە لەفتنەی دەجال ٠ وە خـۆم دەپارێـزم بەتـۆ لەفتنـەی ژیان ٠ وە پاش مردن ئەی خودایە خۆم دەبارێزم بەتۆ لە گوناەو لەقەرد ٠ پیاوێك عەرزی کردچەند جار گوتت [ اعوذ ] ٠ واتە خۆم دەبارێزم لەقەرد ٠ فەرمووی پیاوی قەردار بەرۆری تووشی درۆکردن دەبـی ٠ بەلێـن دەداو بەجێش ناگەینی ٠ ئەم دوو صفەتەش صفەتی پیاوی منافق و دووڕووە ٠

( دیارکردنی جیاوازی لەبیروڕا لەنێوان ئیمامەکان ] ئەم التحیاتـی کەلەنێش ئەم حەدیثی دوعا کەلەعبداللەی کـوڕی مەسعود دەگێڕنـەوە ٠ هەربژاردراوی ئیمامی ئەعزەمە ٠ لای ئیمامی شافعیش هەلبژاردراو (التحیات والمبارکات والصلوات والطیبات السلام علیك ٠٠٠٠٠٠ الـخ هەتـا واشهد ان محمدا رسول الله ) لای ئیمامی مالکیش هـەلبژار دراائەمـەیە التحیات لله الزاکیات لله ٠ والصـلواة للـه السـلام عـلی عبـده ورسـوله ) لای حەنەفی دانیشـتن بەقـەدەر التحیـات لەشەهادەت هینانی ئاخـری فـەرزە ٠ خوێندنـی التحیاتیش واجبە لای شافعی و حەنبەلی داینشتن و خوێندن هـەردوویان فـەرزە ٠ لای ئیمامـی مالك خوێندن سونەتە ٠ دانیشتن فەرزە ٠

٢٥٨ عن ابي بكر (رض) ٠ قال رسول الله صلي الله تعالي عليه وسلم قل اللهم اني ظلمت نفسي ظلما

كثيرا ولا يغفر الذنوب الا انت فاغفرلي مغفرة من عندك وارحمني انك انت الغفور الرحيم ·

( تەرجەمە )

٢٥٨ دەگێرنەوە لەحەزرەتی ئەبووبەکر ڕەزای خودای لێبی گوتی عەرزی پێغەمبەرم کرد (د) دوعایەکم فێربکە · لەنوێژ بخوێنم · فەرمووی بلێ : اللهم اني ظلمت ···· الخ ) ·

مەعنای دوعا : ئەی خودایە بەبێگومان من زولم لەڕوحی خۆم کرد · زولمێکی زۆر هیچ کەسێش لەگوناهان خۆش نابی تۆنەبی ئنجا لێم خۆش بە · بەلێخۆشبوونێك لەلایەن خۆت نەوەك بەلێوەشایی خۆم چونکی من هیچ استحقاقم نییە وە ڕەحمم پێبکە چونکی بەڕاستی وبێشك هەرتۆ لەگوناه خۆش دەبی و ڕەحمبەری ·

## ٢٥٩ عن أبي هريرة ( رض ) قال النبي صلي الله تعالي عليه وسلم الا احدثكم بما ان اخذتم ادركتم من سبقكم ولم يدرككم احد بعدكم وكنتم خير من انتم بين ظهرانيهم الا من عمل مثله تسبحون وتحمدون وتكبرون خلف كل صلاة ثلاثا وثلاثين ·

٢٥٩ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە · ڕەزای خودای لێبی · گوتی هەژارەکان ئەصحابی پێغەمبەر · هاتن بۆخدمەت پێغەمبەر(د) · گوتیان ئیماندارەکانی دەولەمەند · بۆخۆیان گەیشتن بەخۆشییەکان ·

بەدەرەجاتی بەرز ئەوانیش وەکوو ئێمە نوێژ دەکەن • ئێمە چلۆن بەرۆژوو دەبین ئەوانیش بە رۆژوو دەبن • ئەوان زیدەکی یەکی تریان لەسەر ئێمە هەیە • بەسەبەب مال کەحەجی پێدەکەن عومرەی پێ دەهێننەوە وغەزا دەکەن و صەدەقەوخێر دەکەن ئێمە لەم چوارانە بێبەشین • فەرمووی ئاگاداربن من خەبەرێکتان پێدەدەم بەشتێکی وا ئەگەر بەجێی بهێنن دەربارەی دەرەجاتی بەرز بەوانە دەگەن کەلەپێش ئێوە کەوتوونەتێ و، بەئێوەش ناگا هیچ یەکێك لەپاش خۆتان ( یەعنی ئێوە دەگەنە ئەوانەی کەلەپێش ئێوە رۆیشتوون • بەلام وەچەکانی ئێوە ناگەنە ئەوانی پێش خۆیان کەئێوەنە • ) •

وە ئێوە دەبنە باشترین هاوچەرخەکانی خۆتان • کەئێوە کەوتوونەتە نێوانی یانەوە • مەگەر ئەوکەسە نەبێ کەعەمەل کەرێکی وەکوو ئەوبێ • شتەکەش ئەمەیە • لەپاش هەموو نوێژێکی ۳۰ وسێ ۳ جار تەسبیحو تەحمیدو تەکبیر بکەن یەعنی بلێن •

سبحان الله الحمدلله الله اکبر هەتاهەریەکێك لەم سێیانە ئەبێ بەسی ۳۰ وسێ ۳ •

۲٦۰ عن المغيرة ( رض ) • ان النبي صلي اللـه تعالى عليه وسلم كأن يقول في دبر كل صلاة مكتوبة لا اله الا الله وحده لاشريك له لـه الملك ولـه الحمد وهو على كل شيء قدير اللهم لامانـع لما اعطيت ولا معطي لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجد ) •

( تەرجەمە )

٢٦٠ دەگێرنەوە لەموغیرە ـ ڕەزای خوادی لێ بێ · گوتی بەڕاستی پێغەمبەو(د) · لەپاش هەموو نوێژی فەرز · دەی گوت لا اله الا الله وحده ··· الخ مەعنا : هیچ‌شتێك شایانی ئەوەنی‌یەبیەرستری خودای گەورە نەبێ کەبەزاتی ئەقدەسی خۆی وە بەصفاتی کەمالیەی خۆی تەنیایە · عەقلا ونەقلا بەقەطەی شەریك‌و نەظیری نی‌یە هەربۆئەوە دەسەلات لەسەر هەموو شتێك وەهەر بۆ ئەوە سوپاس‌و ستایش وە ئەو لەسەر هەموو شتێك‌توانایە ئەی خودای بۆهەرشتێکی کەتۆ بیدەی هیچ‌مانعێکی نی‌یە · وەهەر شتێکیش کەتۆ نەیدەی هیچ‌کەس‌نی‌یە بیدات · وە کەلك نادا بە خاوەنی مال‌و سامان · مالەکەی · لەبەرامبەر هەر ئیرادەیێکی تۆ کەدەرحەق بەئەوت‌هەبێ ·

٢٦١ عن زيد ابن خالد الجهني ( رض ) · قال النبي صلي الله تعالي عليه وسلم هل تدرون ماذا قال ربكم عز وجل · قال اصبح من عبادي مؤمن وكافر فأما من قال مطرنا بفضل الله ورحمته فذالك مؤمن بي كافر بالكواكب · واما من قال مطرنا بنوء كذا وكذا فذالك كافر بي مؤمن بالكواكب ·

( تەرجەمە )

٢٦١ دەگێرنەوە لەزەیدی کوڕی خالدی جوهنی ڕەزای خودای لێ بێ

گوتی‌پێغەمبەر(د) :  نوێژی سبەینەی بۆئێمە کرد لەحودەیبە لەپاش باران کەلەوشەوەباری  بوو وەکوو نوێژی تەواوکرد ڕووی لە یارانی خۆی کرد · فەرمووی ئەرێ دەزانن خودای بەخێوکەری ئێوە چی‌گوت گوتیان خوداو پێغەمبەری خودا دەزانی گوتی خودا فــەرمووی هەندێــك لەبەنــدەکانی بەڕاستی ئەهلی ئیمانن · هەندێکیش کافر بوون ئنجا ئەو نەی کەگوتیان باران بۆئێمە باری بەچاکەومەرحەمەتی خودا · ئەوانە بەئیمــانی تــەواو ئیماندارن بەمن ·

باووڕ بەکارتێ‌کردنی  ئەســتێران ناکەن باووڕیــان پێ‌نی‌یە · وە ئەوکەسەی بلێ ئێمە بارانمان بۆیاری بەدەرچوونی فلان ئەستێرە یــا بەداڕژانی فلان ئەستێرە ئەوە باووڕی بەمن نی‌یە(واتەبەخودا) · باووڕی بەئەستێران هەیە ·

( ش ) : یەعنی هەرکەسێك لەپەیداکردنو نەهێشتنو بەخشین · وە مەنع دەرحەق بەهــەر کەلکێكو زیانێــك · تەنیــا خودای گەورە بــە کارتێ‌کەر(مؤثر) نەزانی بێ گومان‌کافرە · بەلام ئەگەر خودا بە کارتێ‌کەر (مؤثر)بزانی بەلام بۆهەرشتێك (سەبەبەکی)داناوە · وەکوو برین بەشیرو سووتاندن بەئاگرو ڕۆیین بەقاچو گرتن بەدەست ئەوەیان قەی‌ناکا ·

## ٢٦٢ عن عقبة ( رض ) قال رسول الله صلي الله تعالي عليه وسلم ذكرت شيئاً من تبر عندنا فكرهت ان يحبسني فأمرت بقسمته ·

( تــەرجــەمــە )

٢٦٢ دەگێڕنەوە لەعەقەبە ـ ڕەزای خودای لێ‌بی · گوتی لەمەدینــە

نوێژی عەسرم لەدووای پێغەمبەر کرد(د) ٠ لەپاش سەلام زۆر بەچوستی هەلستا لەسەر صەفەکانی جەماعەت ئاوابوو ٠ ڕۆیشت بۆ حوجرەی یەکێك لەدایکەکانی ئیمانداران ئەصحابی‌کیرام لەچوست ڕۆیشتنی پێغەمبەر(د) ٠ ترسێکیان لێ‌پەیدابوو سەریان سوڕما ٠ پاشان زوو هاتەوە لایان چونکی تێگەیشت سەریان لەم‌کارەسوڕما ٠ فەرمووی شتێك لەزێڕ لامان هەبوو ئنجاپێم ناخۆش بوو حەپسم‌بکا٠(واتە فکروزەینم هەرلەسەر ئەوبێ ئاگام لەنوێژ نەمێنێ) ٠ ئنجا ئەمرم کرد لەسەر فەقیران دابەشی‌بکەن ٠

( ش ر : لەم حەدیثە وازاندراوە بیرکردنەوە لەکاروباری‌چاکە زیان بەنوێژ ناگەیەنی ٠ هەندێ زانایان لەم حەدیثە وەریان‌گرتووە کەدواخستنی زەکات لەدونیا خاوەنی خۆی لە ئاخیرەت حەپس دەکا ٠

٢٦٣ عن جابر ( رض )قال النبي صلي الله تعالي عليه وسلم من اكل من هذه الشجرة يريد الثوم فلا يغشانا في مساجدنا ٠

( تەرجەمە )

٢٦٣ دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی‌عبدالله ـ ڕەزای‌خودای لێ‌بێ ـ گوتی فەرمووی پێغەمبەر(د)هەرکەسێ لەم دارکەسیرە بخوا بانێتە لامان لەمزگەوتەکانمان ٠ چونکی ئەهلی جەماعەت بەبێنی ناخۆشی سیر تووشی ئازار دەبێ ٠

٢٦٤ عن جابر ( رض ) عن النبي صلي الله تعالي عليه وسلم قال من اكل ثوماً أو بصلا فليعتزلنا • أو فليعتزل مسجدنا وليقعد في بيته • قربوهـا كل • فاني أناجي من لاتناجي •

٢٦٤ دەگێرنەوە لەجابر ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ ئەریش لەپێغەمبەر(د) دەگێڕیتەوە • فەرمووی هەرکەسێك سیری خوارد • یاخود پیوازی خوارد• بالە مەجلیسی ئێمە جودابێتەوە یاخۆ فەرمووی لەمزگەوتی ئێمە جوداببتەوە بالەخانووی خۆی دابنیشی • وە پێغەمبەر (د)مەنجەڵێکی بۆهات هەندێ سەبزەواتی کوڵاوی تێداهەبوو • بێنی سیری لێ کرد پێغەمبەر(د) نەیخوارد ئەبوو ئەیوبی ئەنصاری و هەندێ لەئەصحاب لەخدمەتی دابوون • فەرمووی بۆپێش ئەوانی ببەن خۆی نەیخوارد بەئەبوو ئەیوبی گوت تۆبیخۆ چونکە من گفتوگۆ لەگەل یەکێکی وادەکەم کەجوبرائیلە تۆ گفتوگۆی لەگەل ناکەی•

٢٦٥ عن ابي سـعيد الخدري ( رض ) ان النبي صلي الله تعالي عليه وسلم قال • الغسل يوم الجمعة واجب علي كل محتلم •

( تـەرجـەمـە )

٢٦٥ دەگێرنەوە لەئەبووسەعیدی خودری ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ

بەڕاستی پێغەمبەر(د) فەرمووی خۆشووشتن(غوسل)ڕۆژی جومعە واجبە لەسەر هەرکەسێك ئیحتلامی بووبێ ٠

( ش ) : ئەمە لەبەرگرتنی ئەم خۆشووشتنە فەرمویتی واجبە لەحەدیثی ژمارە(٢٦٩) بەدرێژی باسی دەکەین ٠

## ٢٦٦ عن ابن عمر ( رض ) عن النبي صلي اللـه تعالى عليه وسلم قال اذا استأذنكم نساؤكم بالليل الى المسجد فأذنوالهن ٠ وفي رواية الى المساجد ٠

٢٦٦ دەگێڕنەوە لە – کوڕی عمر – ڕەزای خودای لێبێ ٠ ئـەویش لەپێغەمبەر دەگێڕیتەوە فەرمووی وەکوو ئافرەتان ئیزنیان لەئێوە خواست کەبۆ نوێژ بەشەو بۆمزگەوت بچن ئیزنیان بدەن ٠

(ش) : ئیمامی ئەعزەم رەحمەتی خـوای لێبێ گـوتیتی بۆ ئافرەتی ئیختیار بۆنوێژی سبەینەو عشـاجائزە ئیمامی یوسـف کوتیتی بۆژنی‌پیر شەوو ڕۆژ بۆنوێژ بچیتە مزگەوتان هیچ باسی نی‌یـە لەمەزهەبی ئیمامی شافعیش هەروایـە ٠ بەلام جلکـی جوان لەبەرنەکـەن ٠ لەجلکی‌عـادەتی دابن ٠ بۆئافرەتـەکانی گەنـج جوانیـش دروسـتە چونـکی دەرحـەق نەهێلانی ئافرەتان کـەبۆ مزگـەوت بچـن هیـچ حەدیثێـکی پیرۆزنی‌یـە نەبەقسەنەبەکردەوە ٠ نەنهاقسەیەکی‌حـەزرەتی عائشەنەبی لەم بابەتـە هەیە ٠ فەرموویتی ئەوەی ئافرەت لەم‌زەمانە پەیدایان‌کـردووە لەنـەریت‌و عادەتی خراپ وەکوو خۆجوان کردن‌و خۆڕازاندنەوەو خۆیان پیشان دەدەن بەنامەحرەمـان ٠ پێغەمبـەر(د) لەچوونی مزگەوت قەدەغـەی دەکردن ٠

بەفەرموودەی حەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێبی • حوکمی شـــرعی ثابت نابی کەمـــەنعی ئافرەتان لەمزگەوتـان واجببی • چونکیمەنعی حەزرەتی عائشە بەستراوە بەشرطیکی مەعدووم . دیتی پێغەمبەرە(د)بۆژنی ئەم زەمانەی کەپاشزەمانی سەعادەت کەزەمانی پێغەمبەرە دێ • ( شەرقاوی وادەلێ • )

# كتـــاب الجمعـــة

**« باسی نوێژی هـــەینی »**

**( تەرجـــمـــە )**

۲٦۷ عن أبي هريرة ( رض ) انـــه سمع رسول الله صلي اللـــه تعالى عليـــه • يقول نحن الاخـــرون السابقون يـــوم القيامـــة بيدانهم اوتو الكتـــاب من قبلنا ثم هذا يومهم الذي فرض الله عليهم فاختلفوا فيه فهدانا الله لـــه • فالناس لنا فيـــه تبع • اليهود غداً • والنصارى بعد غد •

۲٦۷ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیـرە ( رض ) کەبەڕاسـتی بیسـتی لەپێغەمبەری خودا دەیفەرموو ئێمە یەعنی ئـــەم ئومەتـــە لەدونیا لەڕووی هاتنمان بەگوێرەی عەصروزەمانـــە لەدوای ئومەتـــەکانی پێش خۆمانین • بەلام لە ڕۆژی دوایی لەڕووی چوونە ناو بەهەشتو دەرەجاتی بەرز پێش

ئومەتەکانی پێش خۆمان دەچینە ناوبەهەشــت · کەجوولەکەو دیانن · ئەمەندە نەبێ تەوراتو ئنجیل کەکتابی خودابوون لەپێش ئێمە بەوان‌درا · پاشان ئیمڕۆکە ڕۆژی ـ هەین ـ یە · ئەو ڕۆژەی ئەوانە کەخودا لەسەر ئەوانی فەرزکرد خوداى تێدا بپەرستن بیکەنە گەورەی ڕۆژەکانی خۆیان پاشان لەدانانی ڕۆژی هەینی جیاوازی‌یان لێ‌پەیــدابوو · ڕۆژی شــەموو یەکشەمیان هەلبژارد · بەاجتهادی غەڵەتی خۆیان ئنجا خودا هیــدایەتی ئێمەی‌داو · ڕێگای‌بە ئێمــە نیشــانـــدا بۆئــەم ڕۆژی ـ هەینی‌یــە ـ واتە [ جومعە ] · ئنجا هەموو خەڵك لەم بارەیەوە تابعی ئێمەن · ڕۆژی هەلبژاردەی جوولەکەش بەپێچەوانەی ئەمری خودا سبەیە کەشەموە · ڕۆژی هەلبژاردەی دیانانیش دووسبەیە · کەیەك شەمە ·

( ش ) : حیکمەت لەهــەلبژاردنی جوولەکە بۆڕۆژی شــەموو بــۆ خواپەرستی ئەوبوو دەیانگوت بەخەبەردانی حەزرەتی موســی : گوتیــان خودا عاردو ئاسمانانی لەڕۆژی یەکشەهەوە هەتا ـ جومعــە ـ دروست کرد · ڕۆژی‌شەموو هیچی دروست نەکرد ئێمەش ڕۆژی بێ‌ئیشی‌مان‌دەبی ئەو ڕۆژەبێ · دیانیش چونــکە خــودا لەڕۆژی یەکشــەم دەســتی کــرد بەپەیداکردنی عالــەم · بــەگەورە ـ ترینی · ڕۆژانیــان زانی · بۆیێ ئەوانیش یەکشەمیان هەلبژارد لەسەر پێچەوانەی فەرمانی خودا ·

## ٢٦٨ عن أبي سعيد ( رض ) · قال النبي صلي الله تعالي عليه وسلم · الغسل يــوم الجمعة واجب علي محتلم وان يستن وان يمس طيباً ان وجد ·

( تـەرجـەمـە )

٢٦٨ دەگێڕنەوە لەئەبووسەعیدی خودری ـ ڕەزای خودای لێ بێ · فەرمووی پێغەمبەر (د) غوسل کردن ( خۆشـووشتن ) · لەڕۆژی هەینی واجبە · لەسـەر هەموو بالغێك ( واتەلەسـەرهەمووکەسـێك تەمـەنی گەیشتبتە پازدەساڵ ) · وە واجبە سواك بەکاربێنی ـ بۆخاوێن کردنەوەی دەووە واجبە خۆی بێنێ خۆش بکا ئەردەسـتی کەوێ ( ش ) لێـرە تەعبیر بەواجب بۆ تەئکیدە · یابۆ ڕاگرتنی خاوێنیو ڕەووشت باشی ( یەعنی لەمەرتەبەی لزومو پێویستی یە ) · گۆیا ئەگەر ئەمانـە نەبێ · تەواوی پاکوخاوێنی ڕەووشتی باش نابێ · والحاصل غوسلی جومعە لەمەزهەبی حەنەنیو شافعیو مالکی سونەتێکی مۆکەدەیە · تەنیالای ئـەهلی ظاهرو قەولێکی ئیمامی ئەحمەد واجبە · ئەم غوسلە حـەقی نوێژی جومعەیـە · لەپاش نوێژی جومعە ئەگەر خۆی بشوا جێگای سونەت ناگرێ · بـەلام لەمەزهەبی حەنەفیو شافعی لەپاش دەرچـوونی ڕۆژ لـەڕۆهـەلات هـەتا کاتی جومعە ئەگەر نوێژ بکا · چاکتر ئەوەیە خۆشووشتنەکە لەنوێژ نزیك بکەوێ ئنجا : غوسل بکا · لای ئیمامی مالك بەهەمەحاڵ دەبێ لەنوێژی جومعە نزیك بکەوی ئنجاخۆی بشو: ئەگەر لەپاش غوسـل دەست نوێژی بشـکێ دەبێ دووبارە غوسل بکاتەوە · سواکو بێنی خۆش بـۆ بەجێ گەیشتنی سونەتی پێغەمبەرو پاکێزیو ڕەوشت باشی پێویستو واجبن نەك لەجهەت حوکمی شەرعی واجب بێ ·

## ٢٧٠ عن أبي هريرة ( رضـ ) ان رسول اللـه صلي الله تعالى عليه وسلم · قال من اغتسل يـوم

الجمعة غسل الجنابة ثم راح فكأنما قرب بدنة ٠ ومن راح في الساعة الثانية فكأنما قرب بقرة ٠ ومن راح في الساعة الثالثة فكأنما قرب كبشا أقــرن ومن راح في الساعة الرابعة فكأنما قرب دجاجــة ومن راح في الساعة الخامسة فكأنما قــرب بيضة فاذا خرج الإمام حضرت الملائكة يستمعون الذكر

( تــەرجــەمــە )

دەگێرنەوە لەئەبوو عورەیرە ـ رەزای‌خــودای لێ‌بێ کەبەراســتی پێغەمبەر(د) فەرمووی هەرکەسێك رۆژی جومعە غوسل‌لەخۆی دەربکات لەپاشان‌بچێ بۆنوێژ ٠ گۆیاووشــترێکی کردووتــەخێر وەهەرکەســێك لەسەعاتی دووەم بروا بۆنوێــژ گۆیامانــگایەکی کردووتە خێر ٠ وە هەرکەسێك بروا لەسەعاتی سێیەم گوایا بەرانێی شــاخداری کردووەتە خێر وە هەرکەسێك بروالەسەعاتی چوارەم گۆیا مریشــکێکی کردووتە خێر وە هەرکەسێك بروا لەساعاتی پێنــج گۆیاهێلکەیەکی کردووتــەخێر ئنجا وەکوو ئیمام هاتەدەرێ چووە سەرمینبەر بۆ خطبە ( دوان‌دان ) مەلائکە بەرێزەکان‌خۆیان بۆگوێ‌دانی ئامــادەکرد خێــری هیچ‌ئوچۆیــان نانووسن گوێ دەدەنە خوطبە ئــەم بەشەمەزنــکە لەبارێزەرانی رۆژی جومعەبوون بۆ ئەوانەی زوو بۆنوێژبرۆن بەلام‌بەشــێکی‌تر لــە مەلائکە پاداشتی ئەوان کەسانە دەنووسن کەلە پاشان دێن بەجودا دەفتەر دەگــرن لەهەرچی بیکەن ٠

( ڕوونکردنەوە ) : زوو ڕۆیشتن بۆ جومعە لەکاتی چێشتەنگاو بـۆ ئەهلی جومعە ئەگەرچی سونـەتە بـەلام بۆ ئیمـام وخـەطیب چاکتروایـە درەنگ بچن • چونکی پێغەمبەر(د) ڕۆژی جومعە نوێژ دەبوو ئنجا تەشریفی بۆ مزگەوت دەهات • چواریارانی پێغەمبەریش وابوون •

٢٧١عن سلمان الفارسي ( رض ) قـال : رسول الله صلي اللـه تعالي عليـه وسلم لايغتسل رجل يـوم الجمعة ويتطهر مـا استطاع • من طهر ويدهن من دهنه • او يمس من طيب بيته ثم يخرج فلا يفرق بين اثنين ثم يصلي ماكتب لـه ثم ينصت اذا تكلم الامـام • الا غفر لـه مـا بينه وبين الجمعة الاخرى

( تـەرجـەمـە )

٢٧١ دەگێرنەوە لەسەلمانی فارسی (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی پێغەمبە(د) فەرمووی • غوسل ناکا هیچ پیاوێك • یەعنی تەصور ناکرێ هیچ پیـاوێك کەڕۆژی جومعە غوسل بکا وە ئەوەندەی پێشی دەکرێ دەست نوێژێکی باش بشوا • وە بەڕۆنی پێن خۆش خۆی چەور بکا • یاخۆ لەبێنێـکی خۆش کەلەمالی خۆی هەبێ بەخۆی وەربکا • پاشان بچیتەدەرێ بۆ نوێژی جومعە ، جوداکردنەوش قەبەینی دووکەس پەیدانەکا • بـەم تەرزە لەصفی متصل و تەنگەبەری • پال بەئـەو وەبنی پـەل بەئەووەبنێ عـالەم ئەزیەت بـدا •

هەتاجێگای خۆی دەگاتەوە • پاشان نوێژبکا ئەوەندەی کەبۆیداندراوە • یاخۆ ئەو فەرزو سونەتی کەئەمری پێکراوە بیکا • پاشان وەکوو دوانەدەر ( خطیب ) • لەسەرمینبەر دەستی بەخوێندنی خوطبەکرد قسەنەکا • مەگەر بێشك عەفوو دەکرێ لەگوناهی بەینی جومعەی حازرو - جومعەی رابردوو •

وا دەزاندرێ لەم حەدیثە هەرکەسێك لەهەموو جومعەیەك ئەمەبکا بەپاکیدەچیتە لای خودای گەورە •

## ٢٧٢ عن عمر ( رض ) اللـه تعالي عنـه • قال رسول الله صلي الله تعالي عليه وسلم • انما يلبس هذه من لاخلاق له في الآخرة • اني أكسكها لتلبسها •

( تەرجەمە )

٢٧٢ دەگێرنەوە لەحەزرەتی عومەر - رەزایخودای لێبی • چاوی بە قوماشێکی کەوت لەئارمووشبوو لەدەرگەی مزگەوت گوتی یارسولالله کاشکی ئەم قوماشەت بکڕیایە لەرۆژی جومعە - لەبەرتبکردایە • وەلەرۆژی هاتنی وەفد یەعنی لەرۆژیهاتنی ناردراوی شایەکانو ولاتەکن بۆلایتۆ • فەرمووی بەراستی ئەمەکەسێك لەبەر دەکا کەهیچ نەصیبی نەبێ لەئاخرەت • پاشان لەعەیدی ئەوقوماشە چەند قوماشێك بۆپێغەمبەرهات • قوماشێکیدا بەحەزرەتی عومەریکوڕیخەطاب • حەزرەتی عومەر گوتی یارسولالله تۆ ئەم قوماشەت بەمندا کەچی ئەورۆژە دەرحەق بەمقوماشە

چەندحەدیثی وات فەرموو کەترساندنی تێدابوو . پێغەمبەر (د)فەرمووی . خۆمن بۆیە ئەمقومাشەم بـە تۆ نەداوە خۆت لەبەربکەی . بەلـکی بۆیێ بەتۆم داوە کەلکێـــکی تری لێ ببینی . مەئەلـەن بیـدەی بەئافـــرەتان . یاخۆبیفرۆشی بەکەسـێك کەبۆی حەلال بی ئنجـا حەزرەتی عومـەریش براینکی مشرکی لەمەکە هەبوو دای بەئــەو . [ ڕۆن کردنــەوە ] . لـەم حەدیثەدا زاندرا لە ڕۆژی جەژنە یاجومعە جلکی جوانی حەلال لەبەرکردنی سونەتە .

## ۲۷۳ عن أبي هريرة ( رض ) قال النبي صلي الله تعالي عليـــه وســـلم لولا ان أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك مع كل صلاة .

( تــەرجــەمــە )

۲۷۳ دەگێڕنەوە لــەئــەبــوو هورەیــرە - ڕەزای خــودای لێ بی . پێغەمبەر(د) فەرمووی : ئەگەر بە زەحمەتم نەزانیبوایە لەسەر ئومەتی خۆم بەوجوب ئەمرم پێ دەکردن سواك بکەن لەگەل هەموو نوێژ .

## ۲۷٤ عن أنس ( رض ) قـــال النبي صلي اللـــــه تعالى عليه وسلم اكثرت عليكم في السواك .

( تــەرجــەمــە )

۲۷٤ دەگێڕنەوە لەئەنــەس - ڕەزای خودای لێ بی - پێغەمبــەر(د)

فەرمووی دەرحەق بەسواك زۆرم ئەمر بەئێوەكرد جارەهای جار دووبارەم كردەوە · بەتەئكید دەوامی لەسەربكەن ·

٢٧٥ عن ابن عمر ( رض ) قال سمعت رسول الله صلي الله تعالى عليه وسلم يقول كلكم راع · وكلكم مسؤول عن رعيته · الامام راع ومسؤول عن رعيته والرجل راع في اهله ومسؤول عن رعيته · والمـرأة راعية في بيت زوجها ومسئولـة عن رعيتها والخادم راع في مال سيده ومسئول عن رعيته · قال وحسبت ان قال والرجل راع في مال أبيه ومسئول عن رعيته وكلكم راع ومسئول عن رعيته ·

٢٧٥ دەگێڕنەوە لە كوڕی عومەر – رەزای خودایـان لێ بێ · كوتی بیستم لەپێغەمبەر(د) · دەی فەرموو ئێـوە هەمووتـان ئەهـلی رعایەت و ئەهلی حیمایەت و پارێزەرن · وە هەمووتـان بـەرپرسـیارن ( مسـؤل ) وەپسیارتان لێ دەكرێ هەركەس لەرەعیەی خۆی یەعنی هەركەسێك لەم دونیایە بەئیشێك و كارێك فەرمان بەرداره · ئنجا لەقیامەت بە رعایەت و پارێزگاری ئەوكارە بەرپرسیارە مثلا · سـەركۆمـارێك كەچەندمیلەتێـك بەڕێوەببا لەبەر ئەمە كەلازمە لەسەری پارێزگاری مافو حقوقی هەموویان بەڕاست و عەدالەت بەجێ بهێنی · لەدونیا · لەئاخیرەت پسیاری لێ دەكرێ لەئیجرای حدودو ئەحكامی شرعیە · كردنی نوێژی جومعەو جەماعەت ·

پیاوی سەرۆك عائلەش صاحبی رعایەتی ماڵومنــداڵی خۆیەتی لەدونیــا پسیاری لێدەکرێ لەچــاکی جوولانــەوەی لەگەل مــاڵو منــداڵی خۆیو بەجێگەیاندنی ئەومافەی کەلەسەریەتی لەئەدای حقوقی ئەو ماڵو منداڵەی کەرەعیەی ئەوون وە ئافرەتیش حاوەنی رعایــەتو محافظەیــە لەخانووی مێردی خۆی ٠ پسیاری لێدەکرێ دەربارەی محافظەی حقوقیماڵو مناڵو مێردی خۆی ٠ کەرەعیەی ئەوە ٠

خدمەت کاریش پارێزەرەبۆمــاڵی ئاغــای خۆی پســیاری لێدەکرێ لەبەجێگەیاندنی ئەم وەزیفانەی کەلەلایەن ئاغا پێیسپاردراوە ٠ وەپیاو بۆماڵی باوکی خۆی راعیە دەبی بیپارێزی ٠ رۆژی قیامەت لەمحافظەیەو پاراستنە کەرەعیەی ئەوە پسیاری لێدەکرێ ٠

## ٢٧٦ عن أبي هريرة ( رض ) ٠ قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم بعد كلام حق على كل مسلم ان يغتسل في كل سبعة أيام يوم يغسل فيه رأســه وجسده ٠

( تــەرجــەمــە )

٢٧٦ سەرەتای ئەم حەدیثە ـ نحن الآخرون السابقون ـ لەحەدیثی ژمارە [ ٢٦٨ ] ئەمزیادەی کەلێرەیە ٠ لەوێ نەبوو ٠ بۆیێلێرە نووسرا ٠ دەگێرنەوە لەئەبووهورەیــرە ـ رەزای خــودایلێبی ـ پێغەمبــەر(د) ٠ فەرمووی ـ مافێکی پێویــستە لەســەر هەرموســوڵمانێك ٠ کەلــەزەرفی هەرهەفتەیەك رۆژێك سەرو قالبی خۆی بشــوا ( چونــکی بەگوێرەی ـ

النظافة من الايمان ـ پاكژی لەبیشانەكانی ئایین‌و ئادابی ئیسلامی‌یە ٠ ؛
حق: ئێرە بۆ ثبوتی‌وجوب‌نی‌یە ٠ واتــە بۆئەوەنی‌یە كەلەحەدیث هاتووەو
واجبە هەردەبێ ببێ ٠ بەڵكی بۆ ئەوەیە كەخۆخاوێن ڕاگرتن بەشووشتن
دەبێ ٠

## ٢٧٧ عن عائشة رضي اللــه عنها ٠ قــال النبي صلي الله تعالی علیه وسلم ٠ لوانكم تطهرتم لیومكم هذا ٠

( تــەرجــەمــە )

٢٧٧ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی‌عائشە ـ ڕەزای‌خودای لێ‌بی ـ بەشێك
لەئەصحابە بەڕێزەكانی پێغەمبەر لەدێهات‌و جێگایانی لای سەرەوەی مەدینە
یەعنی لەلای ڕۆژهەلات ـ بۆجومعــە دەهاتنــە مەدینــە ٠ پێغەمبــەر(د)
فەرمووی كاشكی خۆتــان پاكژ بشووشتایە ٠ بۆ ئــەم ڕۆژەتان كەڕۆژی
جومعەیە ٠

( ش ) : هۆی ئەم حەدینە : چونكی ئەم‌بەشە ئەصحابەیە لەبەرتۆزو
گەردی ڕێگا كەبۆ ماوەی چوارمیل هەتاهەشــت میل‌دەڕۆیشــتن ئنجــا
دەگەیشتنە مەدینە ٠ بۆیە ئەوەی فەرموو هەتا خۆیان بشۆن ئنجابێنســە
ناو مزگەوت ٠

## ٢٧٨ عن عائشة ( رض ) قال رسول اللــه صلي الله تعالی علیه وسلم لو اغتسلتم ٠

( تەرجـەمـە )

٢٧٨ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە – ڕەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر(د) فەرمووی ٠ بەوکەسانەی کەبۆخۆیان لەکارکردن دابوون هەر بەهەپئەتی خۆیان دەچوون بۆنوێژی جومعەو دەهاتنەوە کاشـکی غوسـلتان بکردایە واتە خۆتان بشووشتایە ٠ ئنجابهاتنایە ٠

٢٧٩ عن أبي عبس ( رض ) سمعت رسول اللـه صلي الله تعالى عليـه وسـلم من اغبرت قدماه في سبيل الله حرمه الله على النار ٠

( تـەرجـەمـە )

٢٧٩ دەگێڕنەوە لەئەبوو عەبس ـ ڕەزای خودای لێ بێ ٠ لەحالەتێك کەبۆجومعە دەچوو گوتی بیستم لەپێغەمبەر(د)٠دەی گوت هەرکەسـێك لەڕێگای ڕەزای خودا قاچەکانی تۆزاوی ببێ خودا لەشی ئەوکەسە حەرام دەکاڵە ئاگر ٠

(ش) : حەدیث غەزاوشەڕلەگەل کافران حەجو جومعەو جـەماعەتەو هەرچی خوا پەرستی بێ دەگرێتەوە ٠

٢٨٠ عن معاوية ( رض ) ٠ الله اكبر الله اكبر ٠ قال المؤذن اشهد ان لااله الا الله فقال وانا فلما قال أشهد ان محمدا رسول الله فقال وانا ٠

( تـەرجـەمـە )

٢٨٠ دەگێرنەوە لەمعاویەی کوڕی ابوسفیان ڕەزای خودایان لێ‌بی ٠ ڕۆژی جومعە دانیشت لەسەرمینبەر وەکوو بانگدەر بانگی‌دا گوتی اللهاکبر الله اکبر ٠ معاویەش گوتی الله اکبر الله اکبر مؤذن ـ بانگدەر ـ گوتی اشهد ان لا اله الا الله ـ معاویەش گوتی وانا ( یەعنی منیش شـــاهدم پەرستراوەکی‌ڕاستی‌نی‌یە خودانەبێ ) ٠ مؤذن بانگدەر ـ گوتی واشهد ان محمدا رسـول الله معاویــەش گوتی ـ وانـا ( یـەعنی‌منیش شـــاهدم محمد پێغەمبەری خودایە بانگدەر وەکوو بانگی تەواوکرد معاویە گوتی ئەی خەلکینە ئەی‌مسلمانەکان من بیستم‌لەپێغەمبەری خودا لەسەرمینبەر چلۆن ئێستا من لەسەرمینبەرم وەکوو بانگدەر بانـگی‌دا ٠ وەکـوو جـوابی‌من کە گوێتان لێ‌بوو وەلامی بانگی دایەوە ٠

( ش ) : لەوانەئەمە تایبەتی‌بێ بەپێغەمبەر چونکی بۆئێمە واسونەتە بەتەواوی وەکوو بانگدەر کلمەی شەهادە ئەدابکەین ٠ لەمەزهەبی حەنەفی وەکوو خەطیب چووەسەر مینبەر وەلام نەدانەوەی بانگی زۆورەوە چاکترە ٠ ( ئەمە لە درالمختار وادەلێ ) ٠

٢٨١ عن سهل ( رض ) ٠ قال النبي صلي اللــه تعالى عليه وســلم مري غلامــك النجار ان يعمل لي أعوادا أجلس عليهن اذا كلمت الناس ٠ ايها الناس انما صنعت هذه لتأتموا بي ولتعلموا صلاتي ٠

## ( تەرجەمە )

٢٨١ دەگێڕنەوە لەسەهل ( ڕەزای خودای لێ بێ ) پێغەمبەر(د) بەخاتوونێکی گوت بەعەبدەکەی نەجاری خۆت بلێ لەچەند تەختە دارێك مینبرێکم بۆدروست بکا بۆ خوطبەو نەصیحەتو ئامۆژگاری خەلکی لەسەر دابنیشم • ئنجا بۆی دروست کراو بۆیشی داندرا • ڕۆژێك لەسەرمینبەری پیرۆز نوێژی دابەست • خەلکیش دایان بەست لەپاش فاتحە داهاتەوە بۆرکوع عالەمیش داهاتنەوە لەپاشان ڕاست بۆوە • پاشان لەسەر مینبەر پاشەوپاش کشاوە سەرعارد سەجدەی برد • پاشان چۆوە سەرمینبەر • ئنجا بەم دەستوورە لەحەموو ڕکعەتەکان بۆسەجدە دەهاتەسەرعەرد • پاشان وەکوو سەلامی داوە فەرمووی ئەی خەلکینە بۆیێ وام کرد هەتا ئێوەش وەکوومن بکەن وە فێری نوێژی من ببن لەخشوعو ملکەچی •

( ش ) : ئەمە یەکەم مینبەر بوو کەلەزەمانی پێغەمبەر دروست کرا اسمی آلەتە یەعنی ئالەتی ارتفاع • ( واتە بەرزی ) • بەفەتحی میم – لەفظی منبر – لەنبر ینبر وە وەکوو ضرب یضرب • بەکەسری میم اسمی مکانە • یەعنی جێگای بەرز • لەپێش ئەم مینبەرە • جێگای خوطبەی ئەو قەدی دارخورمابوو • کەلە ئەنجومەنێکی گەورەی ئەصحابەی پێغەمبەر لەبەر جودابوونەوەی پێغەمبەر(د) • بەدرێژی دەستی بەگریانێکی بەسۆزو پڕنزگرەکرد • وۆس نەبوو • هەتا بەدەستی پیرۆزی خۆی ئامێزی تێوەرنەهیناو نەی لاواندەوەو دلی نەدایەوە • لەڕیوایەتێك لەژێرمینبەری پێغەمبەر • لەعەرد شرایەوە •

**٢٨٢ عن عمرو ابن تغلب ٠ ( رض ) ٠ قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم ٠ اما بعد فوالله اني لأعطي الرجل وأدع الرجل والذي أدع أحب الي من الذي أعطي ولكن أعطي أقواما لما أرى في قلوبهم من الجزع والهلع وأكل أقواما ٠ الى ما جعل الله في قلوبهم من الغنى والخير فيهم عمرو ابن تغلب ٠**

( تەرجەمە )

٢٨٢ دەگێڕنەوە لەعەمری کوڕی تەغلیب ـ ڕەزای خودای لێبێ ٠ هەندێ مالیکافران بۆپێغەمبەر هاتبوو ٠ لەومالە بەهەندێکانیدا ٠ هەندیکیشی بەجێهێشت ٠ خەبەری پێگەیشت گلەییەك کراوە ئنجاپێغەمبەر(د) لەپاش سوپاس‌وستایش فەرمووی والله العظیم من بەڕاستی مال بەهەندێ‌کەس دەدەم ٠ وەبەهەندێکانیش نادەم حالیش‌وایە ئەوانەی پێیان نادەم لایمن ـ خۆشەویست‌ترن لەوانەی کەپێیان دەدەم٠ بەلام ئەو قەومانەی کەپێیان دەدەم چونکی دەبینم لەناودلیان ترس‌وبێئارامی هەیە ٠ بەلام ئەوانەی کەخودا تەوەکولی داینێ‌وبێ‌ترس لە صەبرو دەولەمەندیەی‌حوا لەنێو دلی‌ئەوانی داناوە تۆلەی ئەومەدەکاتەوە بۆئەوان ٠ بۆیێ پێم‌نەدان ٠ عەمری کوڕی تەغلیب لەوانەیە ٠ ( عەمری کوڕی تەغلیب گوتی ئەم فەرموودەی پێغەمبەرم لاشیرنتربوو لەمێگەلە ووشترێك ) ٠

٢٨٣ عن ابـــن عباس ( رض ) قال النبي صلي اللـــه تعالى عليه وسلم ايهـــا الناس الي أما بعـــد فان هذا الحي من الانصار يقلون يكثر الناس فمن ولي شيئا من أمة محمد ( صلى الله تعالى عليه وسلم) فاستطاع ان يضر فيه احـــداً او ينفع فيه أحداً فليقبل من محسنيهم ويتجاوز عن مسيئيهم ٠

( تـــەرجـــەمـــە )

٢٨٣ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عبـــاس ڕەزای خودایـــان لێ بێ پێغەمبەر(د) لەناساغی دوایی ٠ لەخوطبەی دوایی فەرمووی ئەی خەڵکینە وەرنە نزیکم لەپاش سوپاس‌و ستایش ئەم قەبیلەی ئەنصـــار کەخەڵـــکی مەدینەن ئەم دەبن خەلکی دیکەش زۆر دەبن ٠ ئنجاهەرکەسێك لەئومەتی محمد بووبەخاوەنی ئیش‌و کارێك‌و والیـــەك پێشـــی‌کرا لەویـــلایەتەکـــەی خۆیدا زەرەر بەکەسێك بگەنەنێ یاکەڵکێکی پێ‌بکەیـــەنێ یاقبـــوول بکـــا چاکەی پیاوە باشەکانی ئەنصـــاری بـــەڕێز یـــەعنی لەبەرامبـــەر چـــاکەیان چاکەیەکی باشتریان دەرحەق بکا ) ٠ وە تجاوزو چاوپۆشی بکا لەقصوری ئەهلی قصورەکانیان ( یەعنی لەبەرامبـــەر کەم‌تەرخەمی ئەوان بەدکاری نەکا ) ٠

٢٨٤ عن جابر ( رض ) أصليت يافلان قال لا قال قـــم فصل ركعتين او فاركع ٠

( تـەرجـەمـە )

٢٨٤ دەگێرنەوە لەجابری کوری عبداللهی ئەنصاری رەزای خودای لێ بی گوتی · رۆژی جومعە پێغەمبەر(د) · خوطبەی دەخوێندەوە · پیاوێك دەهاتە مزگەوت پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەیفـلان تۆ ئـەرێ نوێژت کرد پیاوەکە گوتی(نا) · فەرمووی هەستە دوو رکعەت نوێژبکە ·

( ش ) : ئیمامی شافعی استدلالی بەم حەدیثە کردووە ( واتە بەلکەی ئەم حەدیثەیە ) · کەسەلامی مزگەوت ( تحیة المسجد ) لەکاتی خوێندنەوەی خوطبەش دەکرێ · لای ئیمـامی حەنەفی ومالکیش مەنعیـان کردوە بـە بەلگەیەکی تر کەهەلیان وەشاندووتەوە ( شرقاوی : جزءی(١) : ص ٣٠٨ ) ·

٢٨٥ عن أبي هريرة ( رض ) قال النبي صلي الله تعالى عليه وسـلم اذا قلت لصاحبك يـوم الجمعة أنصت والامام يخطب فقد لغوت ·

( تـەرجـەمـە )

٢٨٥ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە ( رەزای خودای لێ بی ) پێغەمبەر(د) فەرمووی · وەکوو بەهەڤالی خۆت بـلێی رۆژی جومعـە لەکاتی خوطبـە دەخوێنرێ ووسـبە : بەراستی قسـەیەکی بێ فائـدەت کـرد · یەعنی قسەیەکی بێ کەلکو موستەکرهو مەذمومت کرد شرعا ·

٢٨٦ عن أبي هريرة ( رض ) قال ان رسول الله

٢٨٦ عن أبي هريرة ( رض ) قال ان رسول الله صلي الله تعالى عليه وسلم ذكر يوم الجمعة فقال فيه ساعة لايوافقها عبد مسلم وهو قائم يصلي يسئل الله تعالى شيئا الا أعطاه اياه ٠

٢٨٦ دەگێڕنەوە لەئەبووهورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی بەڕاستی پێغەمبەری خودا گوتی لەباسی ڕۆژی جومعە ٠ لەڕۆژی جومعەدا سەعاتێك هەیە ٠ تەصادوفی ئەوسەعاتە ناكا بەندەیەكی موسولمان كەڕاوەستابی نوێژبكا ٠ ڕجابكالەخودای گەورە هەرشتێك الامەگەر خودا پێی دەدا ٠

(ش) : مەرج نی یە كەلەنوێژ ئەم ٠ ڕجایەبكا بەلكی ڕاوەستابی بۆ نوێژ یالەكاتی دوعا ٠ یالەمزگەوت لەچاوەڕێ كردنی نوێژ كافیە ٠ لەسەر فەرموودەی عولەما ٠

## « باب صلاة الخوف »

### باسی نوێژی ترس

٢٨٧ عن ابن عمر ( رض ) قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم اذا اختلطوا قياماً وان كانو اكثر من ذالك فليصلوا قياماً وركباناً ٠

( تەرجەمە )

٢٨٧ دەگێڕنەوە لەعبدالله كوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی ٠

پێغەمبەر (د) فەرمووی لەکاتی شەڕکردن لەگەل دوژمنەکوو بەناویەکتریەو وەربوون · با بەپێوە نوێژبکەن · وە ئەگە رەهاتو هێزی دوژمن ئەمە زیاترببوو · چیبەپێوە چیبەسواریبێ هەرچلۆنێکی ڕێك کەوت بانوێژ بکەن :

( ش ) : ئەم حەدیثە پیرۆزە بەڵگەی ئیمامی شافعیە · کەفتوای داوە · نابێ لەهیچ حالەتێك نوێژ نەکرێ بەئیشارەی سەروچاوسەجدەو رکوع بەجێ بگەنین · ڕوو لەقیبلەکردن لازم نییە لای ئیمامی ئەعزەم لەکاتی بەناویەکتری وەربوونی لەشکری ئیسلامو دوژمن بەنێزە بنوێژیان دوابخەن · پاشان نوێژەکە بگێڕنەوە بەدەلیلی حەدیثی جابرژمارە (١٩٤)· ( ایکیتریش ) · جەماعەت ئەو کاتە هەیە کەهەردوولەشکر لەبەرامبەری یەکتریبن با تاکو تووکیش تەقە هەبێ · بەلام وەکوو بەناو یەکتری وەربوون بەاتفاقی مەذاهب ( واتە بەقسەی هەموو مەزهەبەکان ) نوێژکردنی بەکۆمەڵ ( جەماعەت ) · نییە ·

## ٢٨٨ عن ابن عمر ( رض ) قال النبي صلي اللـه تعالى عليه وسلم لايصلين احـد العصـر · الا في بني فريظة ·

( تـەرجـەمـە )

٢٨٨ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێبی گوتی وەکوو پێغەمبەر (د) لەغـەزای ئەحزاب گەڕاوە بۆمـەدینـە · فـەرمووی باهیچ کەسێك نوێژی عەسر نەکا · مەگەر لەقەبیلەی بەنی قورەیظە نەبێ ·

لەپێشدانا نی چەگوو ئەسلەحە چونگی لەگەل دوژمنەکانی ئیسلام لەقورەیش و عەشیرەتە جۆربەجۆرەکانی کافر • لەدژی ئێمە ڕێك کەوتن • ئنجاهەندێ لەئەصحابە بەڕێزەکان لە ڕێگا نوێژیان کرد • هەندێکیش نوێژیان نەکرد بەاجتهادی تووش نەهاتنی موخالەفەی ئەمری پێغەمبەر (د) • حیکایەتی ئەحوالی هەردوو فیرقە لەخدمەت پێغەمبەر کرا • هیچ کامێکیانی تەوبیخی لازم نی یە • بەلکی پاداشتی بۆهەیە •

## « باب صلاة العيدين »

### باسەکانی دوو جەژن

۲۸۹ عن عائشة ( رض ) قال رسول اللـه صلي الله تعالى عليه وسلم دعهما أنشتهين تنظرين • دونكم يا بني أرفدة حسبك اذهبي •

( تەرجەمە )

۲۸۹ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێبی • ڕۆژێکی جێژنە لەپێش بالغ بوونم دووکچ دەفیان بۆمن لێدەدا • ئەو هەربەستانەی کەباسی سەرکەوتنی عەشیرەتی ئەوس بەسەر خەزرەج دا دەکا • ئەویان دەگوتەوە لەشەڕی ( بعاث ) کەسێ ساڵ لەپێش هیجرەت بوو دەیان خوێندەوە • وەلەو حالەدا پێغەمبەر تەشریفی کردە حوجرەی من لەسەر جێگای خۆی دانیشت • ڕووی پیرۆزی لەئێمە وەرگێڕا • لەو کاتەدا •

ئەبووبەکریش هاتە ژووریّ • منی بەسەر خۆمدا شکاندەوە • گوتی چلۆن دەبی لەخدمەت پێغەمبەری خودا ـ دووزەلەی شەیتان هەبیّ گەفی لەمن کرد پێغەمبەر (د) ڕووی لەئەبووبەکر کرد فەرمووی وازیان لیّبێنە • چونکی هەر قەومێك چەند ڕۆژی جەژنەیان هەیە • ئیمرۆش جەژنەی ئێمەیە • بابۆخۆفیان ئەوها کەیف خۆشی خۆیان دربرن • پاشان بە چاو ئیشارەم بۆکردن • ڕۆیشتنە دەرەوە • [ لەم حەدیثە پیرۆزە زاندرا کەدەف لێدان لەڕۆژی جەژنەو داوەتو ئاهەنگەو هاتنی مێوان جائزەو دروستە • وەبە تەئییدی حەدیثی ( أعلِنوا النکاح ولو بالدف ) • دروست بوونی دەفلێدان ثابتەو دیارە • پاشان حەزرەتی عائشە فەرمووی ئەو ڕۆژە کەجەژنە بوو هەندیّ عەسکەری سوودانی بەمەتاڵو زەرگو ڕم تەمرینات و تەعلیماتیان دەکرد • منیش داوام کرد لەپێغەمبەر ( د ) • کەیاریدە بفەرمویّ تەماشایان بکەم • یاخۆ خۆی فەرمووی ئەی عائشە ئارەزوو دەکەی تەماشای گاڵتەی مەتالی سوودانیان بکەی • منیش گوتم ئارەزوودەکەم • ئەی پێغەمبەری خودا ئنجا مدی لەپەنای خۆی ڕاگرت ڕوومەتمان لەنزیك یەکتری بوو زەمانێك تەماشای گاڵتەی سوودانیانمان کرد گاە گاە ـ واتە جار جار پێغەمبەر تانی تیّدەدان دەی فەرموو بتان بینم سوودانیەکان • زانایی خۆتان بەدیاربخەن • لەچەکوئامێری شەڕکردن • ئەی کوڕانی ئەرفیدە ئنجائەمەندە ڕاوەستام دوو قاچم شل بوو ماندوو بووم پاشان پێغەمبەر فەرمووی بەس نی یە ئەی عائشە مینش گوتم ( بەڵیّ ) ئەی پێغەمبەری خودا ئنجابەسە • فەرمووی دەی بابڕۆین بڕۆ •

۲۹۰ عن البراء ابن عازب ( رض ) قال سمعت رسول الله يخطب • ان اول ما نبدء به في يومنا هذا •

ان نصلي • ثم نرجع فننحر • فمن فعل فقد اصاب اصاب سنتنا •

( تەرجەمە )

٢٩٠ دەگێرنەوە لەبەرائی کوری عازب - رەزای خودای لێ بی • ووتی بیستم لەپێغەمبەری خودا لەخوطبەی جەژنەی قوربان دەی فەرمووولەپێش هەموو شتێك کەئێمە دەست پێ بکەین ئیمرۆ کەجەژنی قوربانە • ئەمەیە نوێژی جەژنەبکەین لەپاشان بچینەوە مالێ • قوربانی بکوژینەوە ئنجا کەسێك ئەمەبکا بەراستی دەگاتە رەووشتو سونەتی ئێمە •

٢٩١ عن البراء ابن عازب - ض - قال خطبنا النبي صلي الله تعالى عليه وسلم • يوم الأضحى بعد الصلاة • فقال من صلي صلاتنا ونسك نسكنا • فقد اصاب النسك • ومن نسك قبل الصلوة فانه قبل الصلاة ولانسك له شاتك شاة لحم نعم لن تجزي عن احد بعدك •

( تەرجەمە )

٢٩١ دەگێرەنەوە لەبەرائی کوری عازب - رەزای خودای لێ بی ئونی

پێغەمبەر ( د ) · ڕۆژی جەژنی قوربان · لەپاش نوێژی جەژنە بۆ ئێمە خوطبەی خوێندەوە · فەرمووی هەرکەسێك ئەم نوێژەی ئێمە بکا وەکوو ئێمە · وە قوربانیش وەکوو ئێمە بکوژێتەوە · بەڕاستی لەگەل اصولو سونەتی ئێمەیە · وە ئەگەر کەسێکیش لەپێش نوێژ قوربانی بکوژێتەوە · چونکی پێش نوێژ بووە · بەشەرع قوربانی‌یە کەی قبوول نی‌یە ئەبوو بەردەی کوڕی‌نیار خاڵی‌براء بوو · گوتی یارسول‌اللەمن‌لەپێش نوێژ قوربانیم کوشتەوە · وام زانی‌ئیمڕۆ ڕۆژی خواردنو خواردنەوەیە · حەزیشم‌کرد مەڕی من یەکەم مەڕێك‌بێ کەدەکرێتە قوربانی · منیش لەماڵی خۆم کوشتمەوە لێشم خوارد ئنجا بۆ نوێژ هاتم · فەرمووی مەڕەکەی تۆ مەڕی گۆشت بووە · یەعنی بۆگۆشت خواردن کوشتووتەوە · نەك بۆقوربانی · ئەبوبردە گوتی‌یارسول الله ـ چوشتیرێکم هەیە ( چوشتیر بزنی یەك‌ساڵە کەداخلی دووساڵە بووبێ · یەعنی بزنێکی یەك‌ساڵیم‌هەیە لەدوومەڕم پێ باشترە لەگۆشتو قەڵەوی · ئەگەر بیکوژمەوە قوربانیەکەم بۆدەبێ · فەرمووی بەڵێ بۆتۆ ڕاستە لەپاش تۆ بۆهیچ‌کەسێك ڕاست‌نی‌یە ·

( ش ) : ئەم حەدیثە پیرۆزە دەلیلی شافعیە کەبۆ صحەتو ڕاستی قوربانی دەبێ ئەگەر مەڕبێ یەك‌ساڵ کەمترنەبێ · وە ئەگەربزنیش بێ دەبێ لەدووساڵی کەمترنەبێ بەلام لای ئیمامی حەنەفی کاوڕی شەش‌مانگی ئەگەر قەڵەوو بەگۆشت‌بێ · فەرق‌نەکرێ لەگەل‌مەڕ ڕاستە بکرێتە قوربانی ·

## ٢٩٢ عن ابن عباس ( رض ) قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم ما تعمل في ايــام أفضل منها في هذا

العشر ولا الجهاد الا رجل خرج يخاطر بنفسه وماله فلم يرجع بشيء ٠

( تەرجەمە )

٢٩٢ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی‌عەبباس ڕەزای خودای لێ بی ٠ پێغەمبەر ( د ) ٠ فەرمووی ٠ طاعەت‌وعبادەتی هیچ ڕۆژێك گەورەتر نی‌یە٠ لەخواپەرستی کەلەدەڕۆژی مانگی ذي‌لحجەبکرێ ٠ ئەصحابە بەرێزەکان گوتیان لەجهادیش گەورەترە ٠ فەرمووی جهادیش وەك ئەو گەورەنابێ ٠ مەگەر جهادی پیاوێك نەبێ کەروحی خۆی‌و مالی‌خۆی بخاتە مەترسی بۆغەزا ٠ ئنجا نەگەڕێتەوە بۆمالی خۆی بەهیچ‌شتێك لەمال ٠ یاخۆ نەگەڕێتەوەە نەبەمال نەبەڕووح ٠ طاعەت‌و جهادی ئەم پیاوە غەزاکەرە گەورەترە لەعبادەتی ئەهلی عشرذي‌الحجە ( واتە گەورەترە لەخواپەرستی ئەو کەسانەی دەی‌ذي‌الحجە ) ٠

٢٩٣ عن عائشة ٠ ض ـ قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم دعهم أمنا بني أرفدة ٠ وفي روايه ان لكل قوم عيداً وهذا عيدنا ٠

( تەرجەمە )

٢٩٣ حەدیثی عائشە دەرحەق بەگەمەی حەبەشی‌یەکان لەحەدیثی ژمارە ( ٢٨٩ ) ٠ ڕەت‌بوو ٠ زیادلەسەر ئەوێ لەم روایەتە عائشە ـ ڕەزای

حوداى نى بىّ • گوتى ئیمامى عومەر وەكوو چاوى بە گەمەكەیان كەوت ـ زەجرى كردن • پێغەمبەر ( د ) فـەرمووى وازیان لێ بێنـە • با بەئەمینى بۆخۆیان گاڵتە بكەن • لە ڕیوایەتێكى تریش دەڵێ فەرمووى بۆهەر قەومێكو میلەتێك جەژنەیێك هەیە • ئەمەش جەژنەى ئێمەیە •

## « باب الوتــر »

باسى نوێژى ـ ویتر ـ

٢٩٤ عن ابن عمر ( رض ) قال النبي صلي اللــه تعالى عليه وسلم صلاة الليــل مثنى مثنى فاذا خشي احدكم الصبح صلي ركعة واجدة توتر له ماقد صلي •

( تـەرجـەمـە )

دەگێرنەوە لەعبـدالله كوڕى عومـەر ؛ ڕەزاى خـوداى لێ بى پیـاوێك دەربارەى شەونوێـژ پرسـیارى كـرد لە پێغەمبـەر ( د ) • فـەرمووى شەونوێژ كە تەهەجودە دوو ڕكعەت دووڕكعەتە • پاشان ئەگەر یەكێكتان ترسا كە نوێژى سبەیدەى بچێ • با تەهەجودەكانى جووت جووتى بەئەداى یەك ڕكعەت ویترى بگێڕى بەتاق • یەعنى یـەك ڕكعەت ویتر بكا لەپاش تەهەجود •

( ش ) : لاى ئیمامەكانى مالكو شافعىو ئەحمەد بـەدە لیلى ئـەم حەدیثە كەمترى ئەداى ویتر بەیەك ڕكعەت • بەیەك سەلامە • لاى ئیمامى

حەنەفی بەقەطعی یەك ڕكعەت ویتر دروست نی‌یە • بەلكی واجبە دەبێ وەكوو نوێژی مەغریب سێ ڕكعەت بی • لای ئیمامی شافعی ئەگەرچی سێ ڕكعەت دروستە بەلام چاكتر ئەمەیە ڕكعەنی دوایی بەتەنیا بكرێ نەوەك وەك نوێژی مغریبی لێ بی • وانە بە ئەوبچێ • بە دەلیلی حەدیثی دارەقطنی ( لا توتروا بثلاث ولا تشبهوا الوتر بصلاة المغرب • ) قاضی ابو الطیبیش • كەلە شافعیانە گوتیتی ویتر بەیەك ڕكعت مەكروهە • عمادیش لەشافعیانە گوتیتی ئەگەرچی چاكتر ئەمەیە كەڕكعەتی دوایی بەتەنیا بكرێ بەلام بۆخاتری موافەقەی ئیمامی ئەعزەم سێ ڕكعەت پێكەوە بكرێ بە ( متصلی ) باشترە • لەبەر حەدیثی عائشەش – ڕەزای خودای لێ‌بی كەپێغەمبەر ( د ) • وەكوو نوێژی مەغربی كردووە • حاكم ڕیوایەتی كردوە ڕاستیشی كردووتەوە • حەنەفیش استدلالی بەم حەدیثە كردووە لەوجوبی ویتر وەكوو نوێژی مەغریب • متصلا سێ ڕكعەت بی • بادووتشهد ( یەعنی التحیات ) یان یەك ( تەشهود ) • بەیەك سەلام • لای شافعیش ئەمە دروستە بەلام چاكتروایە جیابكرێتەوە بەیەك ڕكعەتی دوایی • هەروەكوو بەچەندێرێك لەمەپێش باس كرا •

## ٢٩٥ عن ابن عمر ( رض ) قال • قال النبي صلي الله تعالی علیه وسلم اجعلوا آخر صلاتكم بالليل وتراً •

( تەرجەمە )

٢٩٥ دەگێڕنەوە لەعبداللەی كوڕی عومەر – ڕەزای خودایان لێ‌بی

گوتی · فەرمووی پێغەمبەر ( د ) بگێڕن آخری نوێژانی خۆتان لەشەودا بەنوێژی ـ ویتر ـ ·

(ش) : بەگوێرەی هەستانەوەی شەو وەهەنستانەوەی ئەصحاب تەهەجودە · ئەم‌حەدیثە پیرۆزە · ئەگەرنا ئەهلی‌سونەت ئەغلەب لەپێش خەوتن لەپاش نوێژی عیشا نوێژی ویتر دەکەن· پاشان وەکوو بۆ تەهەجود هەلستانەوە · پێویست‌ناکا نوێژی ویتر دووبارە بکەنەوە ·

## « باب الاستسقاء »

باسی نوێژی باران

٢٩٦ عن عبد اللـه ابن مسعود ( رضـ ) قال ان النبي لما رأى من الناس ادباراً قال صلي اللـه تعالى عليه وسلم اللهم سبعاً كسبع يوسف ·

( تەرجەمە )

٢٩٦ دەگێڕنەوە لەعبداللەی‌کوڕی مەسعود ـ ڕەزای خودای لێ‌بی ـ پێغەمبەر ( د ) · وەکوو دیتی ئەهلی‌مەکە باوەڕنایەنن فەرمووی یارەبی قاتی‌و گرانیەکی تووشی خەڵکی مەکە بکەی · وەکوو قاتی‌و گرانی زەمانی یوسف لەمصر · بەدەوام بەلکی لەبرسان باوەڕ دەینن · ئنجا بەڕاستی لەماوەی سالێك یەك پشك باران لەمەکە نەباری خەلکی مەکە بەدەرەجەیەك کەوتنە تەنگاوی‌و موزایەقە · گۆشت کەلاکیان دەخوارد ·

دووکەڵو تۆز بەینی عاردو ئاسمانی داپۆشت نەختێ نەرم بوون باوەڕبینن. ئەبوو سوفیان کەسەرۆکی مەکە بوو. ناردیانە مەدینەی پیرۆز بۆخدمەت پێغەمبەر ( د ) . عەرزی کرد ئەیمحمد تۆلەسەر خواپەرستی ئەربەصلەیرەحم دەکەی کەچی خزمەکانی مەکەشتان هەموو لەم قاتیو گرانیە لەبرسان بەهیلاك چوون . ڕجات لێدەکەین . دوعابکەی خودا بارانیان بۆ ببارێنی لەم تەنگاویە قورتار ببین باوەڕت پێ دەینیس .
ئنجا پێغەمبەر ( د ) دوعای فەرموو . وەباوەڕیشیان پێ نەهینا . ئیشارە وەبال ئەمقاتیو گرانییە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتەخوارێ ( فارتقب یوم تأتي السماء بدخان مبين هەتا منتقمون ) .

( ش ) : لەکاتی پێویست نوێژی باران دروستە . وەکوو نوێژی جمعە دوو رکعەتە . بەجەماعەت دەکرێ . بەلام دەبێ خوطبە لەعارد بخوێنرێ لەسەر مینبەر نەبێ . سونەتە : ئەمە قەولی ئیمامییە سێ ئیمامەکەی تریش لەسەر ئەم قسەن . بەلام لای ئیمامی لەعزەم . نابێ بەجەماعەت بکرێ دەبێ تەنیا تەنیا نوێژبکەن . لەزەمانی ئێمە خەلکی لەسەر قسەی سێ ئیمامەکە دەڕۆن .

٢٩٧ عن أنس ( رض ) . قال رسول الله صلي الله تعالى عليه وسلم اللهم اسقنا اللهم اسقنا اللهم حوالينا ولا علينا اللهم على الآكام والجبال والظراب وبطون الأودية ومنابت الشجر .

( تەرجەمە )

٢٩٧ دەگێڕنەوە لەئەنەس ـ ڕەزای خودای لێبێ . گوتی ڕۆژێکی

جومعە پێغەمبەر ( د) ڕاوەستابوو خوطبـەی دەخوێنـد پیاوێك لەدەرگەی
مزگەوت هاتە ژووری بەتكرار چەندجار عەرزی كرد • دوعای بارانمـان
بۆبكە پێغەمبەریش سێجار فەرمووی خـودایە ئاومان پێبـدە وە بارانمان
بۆ ببارێنە • دوعای • پێغەمبەر ( د ) قبوول بوو • هەوور پەیدابوو •
شەش یا حەوت ڕۆژ لەسەر یەكتری باران باری • پاشان جومعەی دووەم •
وەكوو جومعەی پێشوو • پێغەمبـەر ( د ) خوطبـەی دەخوێنـد • عەینی
ئەوپیاوەهاتەمزگەوت گوتی ئەی پێغەمبەری خودا • لەبـەر باران هەموو
مالاتو حەیوانات‌و خۆمان بەهیلاك چووین دوعابكە نەباری • پێغەمبەر(د)
دەستی‌بلندكرد فەرمووی ( اللهم حوالینا ولا علینا ••• الخ ) • مەعنای :
ئەی خودایە یارەبی باران لەسەر ڕەزەری ئێمە مەبارێنە • لەسـەر نەفعی
ئێمەبیبارێنە ئەی خودایە لەسەر تەپۆلكان‌و لەسەرکێوان لەسەر بەرزاییان
وەلەناو زگی شـیوان لەشـوێنی چۆلی خانووی تیانـەبێ وەلە لەوەڕگاو
جێگای شین بوونی دروگیا ببارێنـە • بـەڕاستی لەپـاش ئـەم دوعایـە
هیچی‌تر باران نەباری •

٢٩٨عن أنس(رض) انه صلي الله تعالى عليه وسلم
رفـع يديـه • ثم قال اللهـم أغثنا اللهم أغثنا اللهم
أغثنـا •

( تـەرجـەمـە )

٢٩٨ دەگێڕنەوە لەئەنەس ( ڕەزای خودای‌لێبی ) • کەبەڕاسـتی
پێغەمبەر ( د ) • هەردوو دەستی بلنـدكرد لەپاشـان فەرمووی یاخـودا
بارانمان بۆ ببارێنە یارمەتیمان بدە ( سێجـار دووبـارەی كردەوە • ) •

٢٩٩ عن ابن عباس ( رض ) ان رسول الله صلي الله تعالى عليــه اســلم قال نصرت بالصبا وأهلكت عاد بالدبور ٠

( تـەرجـەمـە )

٢٩٩ دەگێرنەوە لەعبداللّەی کوری عباس رەزای خـودای لێبی ٠ کەبەراستی پێغەمبەری خودا فەرمووی من یارمە تیمدرا لەغەزای خەنـدەق بەبای رۆژهەلات ٠ وەکوو ئەحزابی کافرانی پەرتەپێکرد ٠ قەومی هوودیش سەلامی خوای لێبی بەهیلاکدرا بەبابی رۆژئاوا ٠

٣٠٠ عن ابــن عمر ( رض ) ٠ عنهما عــن النبي صلي الله تعالي عليه وسلم ٠ قال اللهم بارك لنا في شامنا وفي يمننا ٠ قالوا وفي نجدنــا ٠ قــال اللهم بــارك لنا في شامنا وفي يمننا ٠ قالوا وفي نجدنا ٠ قال هناك الزلازل والفتن وبها يطلع أقرن الشيطان ٠

( تـەرجـەمـە )

٣٠٠ دەگێرنەوە لەعبــداللّەی کوریعومــەر ـ رەزای خودایــان لێبی ئەویش لەپێغەمبەر دەگێرتەوە فەرمووی ئەی خودایا مەملەکەتی شــامان بگێری بەخاوەن کەلكوچاکەو بەرەکەت ٠ هاورێکانی بەرێزی پێغەمبەریش

گوتیان ـ نەجدیشمان • دووبـارە ئـەم دوعایەی دووبـارە کردەوە •
هاوڕێکانی دیسان وایان گوتەوە فەرمووی لەمەملەکەتی ڕۆژهەلات باکووری
وولاني خۆمان کە نەجدوعیراقـە زۆر فتنـەو عاردلەرزین ڕوودەدا • یەعنی
یاخی بوونو کوشتار لەبەینی موسولمانان پەیدا دەبێ • وەشاخی شەیتان
لەوێ بەدیاردەکەوێ ( یەعنی حزبی شەیتیان لەوێ ظهوردەکا ) •

ئنجا بەڕاستی وابوو کوشتار لەبەینی ئەصحابان لەلای ڕۆژهەلاتو
باکووری حیجاز کەنەجدوعیراقە پەیدا بوو • ( اللهم ارحمنا في زماننا هذا
واحداق الفتن • وتطاول اهل الجرءة علينا • يالطيف • اسـئلك اللطف
بما جرت به المقادير • ) •

مرادلـەنـەجـد لـەمحـەدیثـە بـەهـەرجێـگایـەکی بـەرز دەلێن
لەتوهامەهـەتاعیـراق • ( قـەسـطەلانی وادەلێ ) • کـەوایـە قابـلە
مەبەسـتلەشـامو یەمـەن ڕۆژئـاواو خـواروو ی حیجـازبێ • مرادیش
لەنەجدڕۆژهەوتوباکووری حیجازبێ • نەك خصوصمەملەکەتی سعودی بێ •
گۆیا دوعای بۆڕۆژئاواوخوارووی حیجازکرد • باسی ڕۆژهەلاتو باکووری
حیجازی نـەکرد • ( ئنجاحـەقیقـەتـەن ئـەوکوشـتارو خـوێنڕژانی
کەلەڕۆژهەلاتو باکووری حیجازکرا نەتەئریخی [٦٥٦]هـ • هەتا (٧٢٨)هـ
لەلایەن جەنگیزخانو هولاکو بەعەسکەری مەغول بەقەطعـی نەبیسـتراوە
هەتابەغایەتێك لەنەفسی بەغدا هەشـتاهەزاری کوشتبێ لەژنو منـدال
کەبەزگ دڕاندن فەوتان لەکەنەو شیوان وەهەروا لەسەمەرقەندو بوخاراو
مەمالکی خوارزمشـاەو حکومتئیران • ئەگەر دەتـەوێ باش شارەزابی
تەماشای جزءی یەکەم بکە لە [ تاريخ العراق بين الاحتلالين ] • بۆئەوەی
ئیمانێکی کاملت ببێ بەم حەدیثە • ) • لەبەر عیلم بەوەی کەخودا داینا وە

که فتحەو عارد لەرزینو عقوباتی زۆریان تیا تەقدیر کراوه ٠ ئەدەبیش وایه دوعایەك نەکا پێچەوانەی قەدەربێ٠ لەگەل کەشفی عاقبەت بەلگی حەرامە والله اعلم ٠

٣٠١ عن ابن عمر ( رض ) ٠ قال النبي صلي الله تعالي عليه وسلم مفتاح أو مفاتــح الغيب خمس لايعلمها الا اللــه ٠ لا يعلم احد ما يــكون في غــد ٠ ولا يعلم احد ما يكون في الارحــام ٠ ولا تعلم نفس ماذا تكسب غدا ٠ وما تدري نفس بأي ارض تموت وما يدري احد متى يجيء المطر ٠

( تـەرجـەمـە )

٣٠١ دەگێرنەوه لەعبدالله کوڕی عومــەر – ڕەزای خـودای لێبێ ٠ پیغەمبەر ( د ) ٠ فەرمووی کلیلەکانی غەیب پێنجن ٠ یاخۆ مەخزەنەکانی غەیب پێنجن ناپانزانێ خودا نـەبێ ٠ هیچ کەسـێك نازانی سـبەینێ چی ڕوودەدا ٠ ناشیزانێ هیچ کەسێك چەلەمنالدانی ئافرەت هەیە٠ ناشزانی هیچ ڕوحێکی مدرك سبەینێ چی دەکا ٠ وەناشزانێ هیچ ڕووحێــکی ئینســانی زانا لەکام عاردێك دەمری ٠ وەناشزانی هیچ یەکێك کەی باران دەبارێ ٠ مفردی مفاتح بەکەسری میم کلیله ٠ مفاتەح بەفەتحی میم مەخزەنو عەنبارد لەسەر قسەی ئەوانەی ئەوحەدینەیان شــەرح کردووه ٠ هەدووشـــیان ڕاســـتە ٠

## « كتاب الكسوف »

### باسی ڕۆژ گیران

٣٠٢ عن أبي بكرة رض اللـه عنه • قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم • ان الشمس والقمـر لاينكسفان لموت احد فأذا رأيتموهما فصلوا وادعوا • حتى ينكشف مابكم • وفي رواية عنه • لكن يخوف الله بهما عباده •

( تـەرجـەمـە )

٣٠٢ دەگێڕنەوە لەئەبی‌بەکر ڕەزای خودای لێبی گوتی لەخـمـەت پێغەمبەری خودابووین ڕۆژگیـڕا پێغەمبـەر ( د ) هەلسـاچووە مزگەوت ئێمەش چووین ئنجـا دووڕکعـەت نوێژی بەئێمـە کرد ڕۆژبۆوە پاشـان فەرمووی خۆرو مانگ ناگیرێن لەبەرمردنی کەسێك • ئنجا وەکوو چاوتان پێ‌کەوتن بەگیراوی • نوێژبکەن وە دوعابکەن هەتادەبنەوە • لەڕۆژگیران نەجاتیتان دەبێ لـە ڕیوایەتێـکی‌تر • لەئەبی‌بەکرە فەرمویتیشـی بـەم ڕۆژگیڕانو مانگ گیرانە خودا بەندکانی خۆی دەترسێنی •

٣٠٣ عن المغيرة ( رض ) قال رسول الله صلي الله تعالى عليه وسـلم ان الشمس والقمـر لا ينكسفان لموت احد • ولا لحياته فاذا رأيتم فصلوا وادعوا الله •

( تـەرجـەمـە )

٣٠٣ دەگێڕنەوە لەموغیرەی کوڕی شوعبە ـ ڕەزای خودای لێ بێ ـ گوتی لەزەمانی سەعادەتی پێغەمبەر ( د ) خۆر گیرا لەوڕۆژەدا کەئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ( د ) وەفاتی کرد ٠ خەلك گوتیـان لەبـەر مردنی کوڕی پێغەمبەر ڕۆژگیرا ٠ پێغەمبـەر ( د ) فـەرمووی ٠ خۆرومانـگ ناگیرێن لەبەرمردنی کەسێك یالەبەر ژیـانی کەسـێك ٠ وەکووچاوتـان پێ کەوت گیراوون نوێژ بکەن وە دوعابکەن لەخودا بپاڕێنەوە ٠

٣٠٤ عن ابن عباس ـ رض ـ عنهما ٠ قال النبي صلي اللــه تعالي عليــه وسلم ٠ اني رأيــت الجنة وتناولت عنقوداً ولو اصبته لأكلتم منــه ٠ ما بقيت الدنيا ٠ ورأيــت النار ٠ فلــم أر منظراً كاليوم قط أقطع ورأيت اكثر أهلها النساء ٠ قالوا بــم يارسول الله قال بكفرهن ٠ قيل يكفرن بالله ٠ قــال يكفرن العشير ويكفرن الاحسان ٠ لو أحسنت الى احداهــن الدهر كله ٠ ثم رأت منك شيئاً ٠ قالت ما رأيت منك خيراً قط ٠

( تـەرجـەمـە )

٣٠٤ دەگێڕنەوە لەکوڕی عەبـاس حـەدیثی ڕۆژ ـ گیران ٠ گوتی

لەپاشان گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا دیتمان تۆ لەجێگای خۆت شتێکت وەرگرت ، پاشان دیتمان خۆت کێشایەوە ، فەرمووی بەهەشتم دیت دەستم درێژکرد بۆ ووشوێك ، ئەگەر بم هینابوایە تادونیامابوو لێتان دەخوارد ،

[ چونکی دەگێرنـــەوە لەخـــەواصی مێـــوەی بەهەشـــت هـــەردنکێك لێ بکرێتەوە خودا دەنکێـــکی تری لەجێ دروســـت دەکاتـــەوە قســـەکەشی بۆهەموانە هەتارۆژی قیامەت بۆ هەموو جەماعەتێك ، سەبەبی نەهینـــانی ووشووە ترێیەکە هەروەکوو [ ابن بطال ] فەرموویەتی ، ئەوەبوو چونکی لەخواردنی بەهەشت بوو کەبێ برانەوەیە ، دونیا فانی یە نامێنێ ودەبڕێتەو جائز نی یە عەقلەن ونەقلەن ، خواردنێك کەهەربمینێ لەدونیایـــەك بخورێ کەهەتاهەتایەنی یە ، گوتراویشـــە ئەگەر بهینابوایـــە ، وە ئەهلی دونیـــا ئەگەر بیان دیتبوایە ، باوەڕی یەکەیان لە نەزاندراوە [ بالغیب ] ، دەبووە ئیمان بە دیتن [ شهود ] ، ئەوکاتە نەوانەبوو تۆبە هەڵبگیرێ ، چونکی ئایەتی پیرۆز دەفەرموێ [ یوم یأتي بعض آیات ربك لاینفع نفساً ایمانها لم تکن آمنت من قبل ، ] ، گوتراویشە چونکی بەهەشت جـەزای کردەوەیە جەزاش ڕوونادا لەآخرەت نەبێ ،

[ شەڕقاوی ــ جزئی ١ ــ ص ٣٢٤ ] ،

وە پێغەمبەر دەفەرموێ ئاگریشم دیت هیچ دیمەنێکم نەدیت وەکوو دیمەنی ئیمڕۆ چاووم بێ کەوت ، سەرسوڕهێنەر ترو ناشیرنتر ، دیتم زۆرترین ئەوانـــەر لە ئاگربوون ئـــافـــرەتوون ، گوتیـــان بۆچـــی ئـــەی پێغەمبەری خودا ، فەرمووی لەبەر کفریان ، گوتیان چما کفـــر بەخـــودای گەورە دەکەن فەرمووی کفرانی چاکەی مێردیان دەکەن ، ئـــەگەر هەموو ژیانی خۆت چـــاکە لەگەڵ یەکەکی‌یـــان بکەی ، پاشـــان شتێکت لێ ببینی

بەپێچەوانەی هەوەسی ئەوبی دەلێ قـەت لەعومری خۆم چاکەیەکم لـە تـۆ نەدیوە ٠

٣٠٥ عن أبي موسى ( رض ) ٠ قال النبي صـلى الله تعالى عليه وسلم ٠ هذه الايات التي يرسل الله لاتكون لموت أحد ٠ ولا لحياته ولكن يخوف الله بهـا عباده فاذا رأيتم شيئا من دلك فافزعوا الى ذكره ٠ ودعائه واستغفاره ٠

( تـەرجـەمـە )

٣٠٥ دەگێرنـەوە لـەئـەبـوو موسـى ـ ڕەزای خـودای لێبی ٠ پێغەمبەر ( د ) ٠

فەرمووی ئەم عەلامـەتانـەی کەخودا دەی‌نێری ٠ لـەبـەر مردنی یەکێك نی‌یە وەلەبەر ژیانی کەسـێکیش نی‌یـە ٠ بەلام بەم عەلامـەتانـە بەندەکانی خۆی ئەترسێنێ ٠ ئنجائەم عەلامەتانە ئەگەر شـتێکتان دیت ٠ پەنا بەرنە بەر یادی خودا ٠ بەپاڕانەو لەحودا ٠ داوای لێبوردن لەخودا٠

( ش ) : نوێژی ڕۆژگیرانو مانـگ گیـران لەسـەر ڕای هـەموو ئیمامەکان مەشروعە ٠ وەکوو نوێژی جومعەدووڕکعەت بەجەماعەت دەکرێ بەلام مەزهەبی حەنەفی لەپاشی ـ فاتحە ـ سورەتێکی درێژ دەخوێندرێ وەکوو سورەتی ( بقرة ) ٠ لای سێ‌مەزهەبەکەی تریش بەڕاسێ دووڕکعەتە بەلام لەهەر ڕکعەتێك دوو ڕکوع ـ داهاتنەوە ـ هەیە ٠ بەم تەرزە وەکوو لەفاتحەو سوورەت خوێندن بۆوە ڕکوع‌دەبا ٠ وەکوو هەلستاوە دووبـارە

. فاتحەو سورەتێك دەخوێنی ركوعێكی تریش دەبا ٠ بەلام لەهیچ مەذهەبێك خوطبەی ناوی بانگی ناوێ قامەتی ناوێ ٠ بـەلام بۆكۆبوونـەوەی خەلك بەشتێكی وەكوو ـ الصلاة جامعة : بۆئیعلان دەستپێ دەكرێ ٠

« أبواب تقصير الصلاة »

باسی كورت كردنەوەی نوێژ

٣٠٦ عن أبي هريرة ( رضـ ) قال : قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لايحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الاخر ان تسافر مسيرة يوم وليلة ليس معها حرمة ٠

( تـەرجـەمـە )

٣٠٦ دەگێرنەوە لەئەبوو هورەیرە ـ رەزای خودای لێبێ ٠ گوتی پێغەمبەر ( د ) فەرمووی ٠ دروست نی‌یە بۆئافرەتێك ٠ باوەری هینـابێ بەخوداو رۆژی قیامەت ٠ كەمەسافەی رۆژووشەوێك سەفەر بـكا هیـچ مەحرەمی لەگەل نەبێ باس‌كردنی ئافرەتی باوەردار مەبەستی دەرهینانی ئافرەتی بێباوەرنی‌یە چـوتكی ئەم حوكمـە عامـە بۆهـەمووئافرەتێكـــە ئەوەی باوەر نەوراتەهەیەو ئەو ئافرەتە كافرانـەی كەلـەشـەریش‌دانـە ئافرەتی ئیسـلامو كافر ٠ نەوئافرەتانـەی ـ كتابیـن ـ نەبـاوەریـان بەموسوییانەتی‌نی‌یە ٠ بەلكی باسی ئافرەتی ئیماندار لەبەر دووبارە كردنەوەی حوكمەبۆئیماندار ٠ چونكی كردنی شـتی بێشـەرعی بەپێچـەوانـەیـە لەگەل‌وجودو هەبوونی ئیمانوباوەر ٠

٣٠٧ عن عمران ابـن حصين ( رض ) قال النبي صلى الله تعالى عليـه وسلم صل قائماً ٠ فان لـم تستطع فقاعداً فان لم تسنطع فعلى جنب ٠

( تـەرجـەمـە )

٣٠٧ دەگێڕنەوە لەعمرانی کوڕی حوصەین ـ ڕەزای‌خودای لێ‌بێ ـ گوتی تووشی نەخۆشی مایەسیری بـووم دەرحـەق بەنوێژکردنی خـۆم پسیارم‌کرد لەپێغەمبەر ( د ) فەرمووی نوێژبکە بەڕاوەستاوی ٠ ئەگەر پێت نەکرا بەدانیشتنەوە بیکە ٠ ئەگەرپێت نەکرا بەپاڵ کەوتن لەتەنیشت بیکە

( ش ) : لای بەشی زۆری فیرقەی شافعی ـ ئەگەر لەمەر تەنشتیش کەسێك بێ‌ی نەکرا لەسەرپشت ڕابکشێ بیکا ٠ پاژنەی لەقبیـلەبێ لای سەری بەرزتربێ لەلای قاچی ٠ ئەگەر واشی‌پێ‌نەکرا ٠ بەسەر ئیشـارە وەباڵ سـەجدەو رکوع‌و انتقالاتی نوێژبـکا ئەگەر بەسـەرپێ‌ی نـەکرا ٠ بەچاوئیشارەبکا ٠ ئەگەر نەی توانی‌ئیشارەش بکا ٠ باکردەوەی نوێژ لەدلی خۆی بکا ٠ کردنەوەشی لەسـەر نی‌یە ٠ خولاصە نوێژ تەرك‌ناکـرێ مادام عەقلی لەجێ‌بێ ٠ بەلام حەنەفیـەکان‌و مالکی‌یەکـان هەندێکش لەشـافعی گوتوویانـە ٠ انتقـال نـاکا لەحالـەتی کەوتنی لەسـەر گازی‌پشت بـۆ حالەتێکی‌تر ٠

« باب التهجد »

باسی شەو نوێژ

٣٠٨ عن ابن عباس (رض) كان رسول الله صلي الله تعالى عليه وسلم · اذا قام من الليل يتهجد قال اللهم لك الحمد انت قيم السموات والارض ومن فيهن ولك الحمد انت نور السموات والأرض ومن فيهن · ولك الحمد · أنت ملك السموات والارض ولك الحمد أنت الحق ووعدك الحق · ولقاؤك حق · وقولك حق · والجنة حق والنار حق · والنبيون حق ومحمد ( ص ) حق والساعة حق · اللهم لك أسلمت · وبك آمنت وعليك توكلت · واليك أنبت · وبك خاصمت واليك حاكمت · فاغفرلي ماقدمت وما أخرت وما أسررت · وما اعلنت · انت المقدم وانت المؤخر · لا اله الآ انت أو لا اله · غيرك ولا حول ولا قوة الآ بالله ·

( تەرجەمە )

٣٠٨ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس – ڕەزای خودای لێ بێ ·

پێغەمبەر ( د ) وەکوو بۆشەونوێژ هەلبستایەوە لەناو نوێژ ئەم دوعایـەی دەخوێندەوە · دەیکوت · ئـەی خـودایە هـەربۆ تۆیە وەصف بەچـانەی اختیاری تۆ رێکخەری کاروباری عالەمی ئاسمانو عاردو علەمی ناو ئەوان وە هەربۆتۆیە وەصف بەچاکەی اختیاری تـۆ رۆناککەرەوەی ئاسـمانوعاردو عالەمی ناو ئەوانی هەبوونیان بەتۆیە [ یەعنی لەوجود کەخاصە بەتۆشتێکت لەسەرهەموو عالەم دابەشیوە · بۆیـە لەبوخـاری دەلێ : پێغەمبـەر (د) فەزموویتی : ذنب الوجود ذنب لا يقاس بذنب آخر ] ·

وە بۆتۆیە وەصف بەچاکەی اختیاری تۆ · کارگێڕوکارهەلسوڕێنەری· ئاسمانەکانو عاردو عالەمی ناوئـەوانی · وە بۆتۆیـە وەصف بەچـاکەی اختیاری · وە تۆ ثابتێکی هەرهەبووی‌و هەر دەبی وەعـدەو بەڵێنی تۆش ثابتە قبوولی دواکەوتن ناکا · دیتنی تـۆ لەبەهەشـت یاخـۆ جەزای تـۆ بۆئەهلیسەعادەت‌وشەقاوەت ثابتەو بێشکە · مەدلولی قەولی تۆ ثابتەو بێ گومان · بەهەشت بۆ ئەهلیسەعادەتەو ئاگر بۆئەهلی شەقاوەت مەوجودن ئێستا· ئەنبیاو پێغەمبەرەکان کەبۆعالەمت ناردوون ڕاستە بەتایبەتی‌لەبەینی ئەوان‌کە محمدت بۆ هەموو عالەم ناردووەڕاستە · حەقەو بێ‌گومـانە · وەهاتنی ڕۆژی قیامەت‌بێشکە ئەی خودایا بۆئەمرو نەهی‌تۆ مطیع‌و منقادم هەر بەتۆ باوەڕیم هەیە · کاروباری خـۆم هەربەتۆ سـپاردووە · بـەدلی خۆشم‌هەربۆلای تـۆ گـەڕاومەتـەوە · وە بەبورهـانو بەلـگەکانی تـۆ بەربەرەکانیم کردووە لەگەل کافران · وە هەر وەبال تۆ موحاکەمەم بـووە لەگەل‌ئەوانی قبولی رسالەتی منی نەکردبێ · ئنجا عەفووم بکە لەهەرچی لەمەپێش کردوومە · وەلەهەرچی نەشم‌کردووە ( لەبەر قصوری خۆم ) · وە لەهەرچی بەدزیم‌کردووە وە لەهەرچی بەئاشکرام کردووە · تۆپێش‌خەری زیندوو بوونەوەی منی لەقیـامەت لەسـەر عالـەم تـۆ پاش‌خـەری منی

لەپەیدابوون لەپێغەمبەرانی‌تر · سەلامی خوایان لێ‌بێ · هیچ پەرستراوی ڕاست نی‌یە تۆنەبی · هیچ‌وەرگەڕان لەگوناە نی‌یە وە هیچ هێزو تاقەتیش لەسەرخواپەرستی نی‌یە بەیاربدەو ئاسان کردنی تۆنەبی ·

٣٠٩ عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما قال قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم نعم الرجل عبدالله · لو كان يصلي من الليل ·

( تەرجەمە )

٣٠٩ دەگێڕنەوە لەعبدالله کوڕی حەزرەتی‌عومەر ـ ڕەزای خودای‌لێ‌بێ ـ گوتی لەزەمانی گەنجی‌و جاحێلیم · لەکاتی کەپێغەمبەر (د) هەبوو · لە مزگەوت دەخەوتم · لەخەوم دیت دووەملائکە هاتن · منیان گرتەو بۆجەهەنەمیان بردم وەکوو دیتم ئەترافی وەکووبیر هەلنرابوو هەندێ کەسم لەناودیت دەم‌ناسین · مینش هەر دەم‌گۆت · اعوذ بالله من النار ـ واتە خۆم دەپارێزم بەخودا لەئاگر ـ گوتی تووشی یەکێکی‌تر هاتین لەمەلائکە گوتی هیچ ترس لەسەر تۆ نی‌یە ئەم‌خەونەم بۆ حەفصەی خوشکم‌گێڕاوە ـ کەخێزانی‌پێغەمبەرە ـ ئەویش گێڕایەوە بۆپێغەمبەر (د) فەرمووی عبداللەپیاوی‌باشە کاشکی شەونوێژی بکردایە ئنجا عبداللەلەپاش‌ئەم خەونە شەونەدەنووست کەمێک‌نەبێ · لەم‌حەدیثە وا زاندرا کەسێک شەونوێژبکا لەجەهەنەم نەجاتی دەبێ · شەونوێژ بالاجماع سونەتێکی مۆکەدەیە · زۆر خەوتنیش بەشەو مەکرووهە ·

★ ★ ★

٣١٠ عن علي كرم الله وجهه قال ، قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • ألا تصليان وكان الانسان أكثر شيء جدلا •

( تـەرجـەمـە )

٣١٠ دەگێڕنـەوە لـەحـەزرەتی عـلي ـ ڕەزای خـوادای لێ‌بی ـ شەوێك پێغەمبەر (د) تەشریف دەفـەرموێ بـۆمالی حەزرەتی عەلی لەكاتێك لەگەل حەزرەتی فاطمە لەپێ‌خەفدا بوون فەرمووی ئەرێ ئێوە هەڵناستنەوە لەخەو شەونوێژەبكەن حەزرەتی عەلیش وەلامی داوە گوتی رووحی ئێمـە بەدەست خودایە • ئەگەر حەزبكا بەخەبەرمان بینی ئـەوا بەخەبەرمـان دەینی • پێغەمبەر (د) بەدڵ تەنگی یەوە ڕووی وەرگێرا • ڕۆیی هیچ‌قسەی نەكرد بەلام لەڕۆیشتن‌دا دیتم دەستی پیرۆزی لەڕانی‌دا فەرمووی • خودا لەقورئان فەرموویتی هەموو ئامۆژگاری‌و عیبرەتێـكم بۆئینسـان بەیـان كردووە • ئینسانیش لەهەمووشتێك زیاتر موجادەلەدەكاو درێژە دەكا لە وەلامی نامەقبوول • گۆیا لەدلێ مبارەكی گرانهات ئەم وەلامەی حەزرەتی عەلی •

٣١١ عن المغـيرة ابن شـعبة ( رض ) قال ، قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • أفلا أكون عبداً شكوراً •

( تـەرجـەمـە )

٣١١ دەگێڕنەوە لەموغیرەی كوڕی شوعبە ڕەزای خودای لێ‌بی •

پێغەمبەر ( د ) بەدەرەجەیەك شەوتوێژی زۆر دەكرد هەتــا هەردوو قاچی موبارەكی لەبەر زۆر ڕاوەستان ئەستوور بوو عەرزی كرا بەئایەتی (عفاالله عنك ) · وەبەئایــەتی ( لیغفر لك ما تقــدم من ذنبـك وما تأخر ) خودا لەگوناهی پێشوو پاشووی‌توو خۆشبووە بۆچ ئەم هەموو ئەزیەتە دەدەیــە بەرخۆت · فەرمووی‌ی ئەدی لەبەرامبــەر لێخۆشــبوون بەندەیێكی زۆر سوپاسكەر نەبم بەعنی لازمە سوپاسی چاكەی لێبوردن بكەم شەووڕۆژ سەرم هەرلەسەجدە دابی ·

٣١٢ عن عبدالله ابن عمر ( رض ) قال ، قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم أحب الصلاة الى الله ، صلاة داود عليه السلام وأحب الصيام الى الله صيام داود · وكان ينام نصف الليل ويقوم ثلثه وينــام ســدســه ويصوم ويفطر يوماً ·

( تــەرجــەمــە )

١ دەگێڕنەوە لەعبداللــەی كوڕی عــەمری كوڕی عاص ( ڕەزای خودای لێبی ) پێغەمبەر ( د ) فەرمووی نوێژی شیرین‌تر لەهەموونوێژێك لای خودا نوێــژی داودپێغەمبــەرە ســەلامی‌خــوای‌لێبی وەشــیرین‌ترینی ڕۆوژووان لای خــودا ڕۆژووی داوودپێغــەمبــەرە ســەلامی خــوای لێبی چونكی‌حالی‌وابوو نیوەی شەو دەخەوت سێ‌یەكی شەو عبادەتی‌دەكــرد وە شەشێكی شــەو دەخەوتــەوە بۆحەســانەوە لەڕۆژوو گرتنیشی ڕۆژوێــك بەڕۆژوودەبوو ڕۆژێك دەی‌شكاند ·

٣١٣ عن أبي هريرة ( رض ) قال ، قال النبي «ص» يعقد الشيطان على قافية رأس أحدكم اذا هو نام ثلاث عقد . يضرب كل عقدة عليك ليل طويل فارقد . فاذا استيقظ وذكر الله انحلت عقدة فأن توضأ انحلت عقدت فأن صلى انحلت عقدة فأصبح نشيطا طيب النفس . والا أصبح خبيث النفس كسلان .

( تەرجەمە )

٣١٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ڕەزای خودای لێبێ - پێغەمبەر(د) فەرمووی وەکوو یەکێك لەئێوەخەوت شەیتان لەپشتەوەی سەری سێ گرێیان لێدەدا لەهەرگرێیەك دەستێکی لێدەدا . دەلێ شەودرێژە بخەوە یەعنی بێترس وازوو ڕۆژ نابێتەوە ئنجا وەکوو بەخەبەرهات وە یادی خودای کرد گرێیەك هەل دەوەشێتەوە پاشان ئەگەر دەست نوێژی شووشت گرێیەکی تر هەل دەوەشتێەوە وەکوو دووڕکعەت نوێژیشی کرد گرێی سێیەمیش هەل دەوەشێتەوە . ئنجا خۆشی یەکو هەوەسێکی ڕووحی ڕووی تێدەکا دلی خۆش دەبی . ئەگەرنا بەڕووحێکی تاریکو تەنگو نەمەلی بەدەنەوە ڕادەبوێری .

٣١٤ عن عبدالله بن مسعود ( رض ) قال ، قال النبي « ص » بال الشيطان في أذنه .

( تەرجەمە )

٣١٤ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود لە حضور پێغەمبەر

باسی یەکێك کرا لەمەجلیس گوتیان • ئەم بیاوە تاسبەینە خەوت هەڵنەستا نوێژەکانی سبەینەشی چوو فەرمووی ـ شیتان میزی لەگوێچکی کرد •

٣١٥ عن أبي هريرة ( رض ) ان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • قال ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة الى سماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر يقول • من يدعوني فأستجيب له • من يسألني فأعطيه ، من يستغفرني فأغفر له •

( تەرجەمە )

٣١٥ دەگێرنەوە لەئەبووهورەیرە ـ رەزای خودای لێ بی • بەراستی پێغەمبەری خودا ( د ) فەرمووی لوطف ومەرحەمەت و قبولی مەعذەرەتی خودای گەورە ، دێتەخوارێ هەمووشەوێك بۆئاسمانی دونیا • وەکووسێ یەکەکی آخری شەو دەمینی دەڵێ کێ لێم دەپارێتەوە بۆجی کە یاندنی ویستەکانی ـ پێی بدەم کێ داوای لێخۆشبوونی گوناهان لەمن دەکا هەتا لەگوناهی خۆشیم •

٣١٦ عن عائشة ( رض ) قالت ، قلت يارسول الله أتنام قبل أن توتر • فقال يا عائشة ان عيني تنامان ولا ينام قلبي •

( تــەرجــەمــە )

٣١٦ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ـ ڕەزای خودای لێ بی · گوتی عەرزی پێغەمبەرم کرد ( د ) گوتم ئەی پێغەمبەری خودا ئەرێ تۆدەخەوی لەپێش نوێژی ویتر فەرمووی ئەی عائشە بێگومان چاوەکانم دەخــەوون · بەلام دلی من خەوی لێ ناکەوی ·

## ٣١٧ عن أنس ( رض ) قال ، قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ما هذا الحبل قالوا هذا حبل لزينب · فاذا فترت تعلقت · فقال لا حلوه ليصل أحدكم نشاطه فاذا فتر فليقعد ·

( تــەرجــەمــە )

٣١٧ دەگێڕنەوە لەئەنەس (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر(د)چووە مزگەوت· دیتی گوریسێك لەبەینی دوو ئەستوونەی مزگەوت ڕاکشــراوە · فەرمووی ئەمەچی‌یە گوتیان ئەم گوریسە زەینەبی دایکی ئیمانداران ڕای کێشــاوە · بو خاتری ئەگــەر ســســتبوو لــەنوێژ خــۆی پێــوەڕابگری فــەرمووی لەئەستوونەی بکەنەوە هەریەکێك لەئێوە بالەسەر شەوق و هەوەسی خۆی نوێژبکا · ئەگەر سستبوو ماندووبوو لەنوێژ بادابنیشی ·

## ٣١٨ عن عبدالله ابن عمرو ( رض ) قال ، قال لي

رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم : يا عبدالله لا تكن مثل فلان كان يقوم الليل فترك قيام الليل ٠

( تەرجەمە )

٣١٨ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی پێغەمبەری خودا بەمنی گوت ئەی عبدالله وەکوو فلان مەکە وەقتێك لەمەپێش لەشەو هەلدەستاوە پاشان تەرکی شەو هەلستانەوەی کرد ٠

( ش ) : بێژراوە موراد لەفلان عبداللەی کوڕی عومەربوو ٠ ئنجا وەکوو ئەم حەدیثەی بیستەوە تا وەفاتی کرد ٠ هەستانەوەی شەوی تەرك نەکرد ٠

٣١٩ عن عبادة ( رض ) أن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال من تعار من الليل فقال ٠ لا اله الا الله وحده لاشريك له ٠ له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير ٠ الحمد لله وسبحان الله ولا اله الا الله والله أكبر ٠ ولا حول ولا قوة الا بالله ٠ ثم قال اللهم اغفر لي ٠ أو دعا أستجب له ٠ فان توضأ وصلى قبلت ٠

( تەرجەمە )

٣١٩ دەگێڕنەوە لەعوبادەی کوڕی صامت ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ

بەڕاستی پێغەمبەری خودا ( د ) فەرمووی هەرکەسێك لەخەو هەلسـتا لەشەوبلێ لا اله الا الله ··· الغ ·

مەعنا : هیچ پەرستراوی ڕاست نی‌یە ـ خوداوەندی عالەم نەبێ تەنیایە هیچ‌شریکی بۆنی‌یە · بۆئەوە هەرچی‌بی‌یەوێ دەکا وەهەر بۆئەوە سپاس‌و ستایش وە ئەو لەسەر هەموو شتێك توانایە وەصف بەچاکەی اختیاری بۆخودایە · تەنزیهی خودا دەکەم · لەهەموو نیشانەی پەیدابوون‌و عەیب‌و نوقصانی‌یەك · وە هیچ خودایەك نی‌یە لایقی پەرستن‌و عیبادەت بێ · پەیداکەرو خالقی ئەم عالەمە نەبێ · وە خوداگەورەیە · وە هیچ بادانەوە لەگوناەنی‌یە هیچ شەنگ‌و هێزیش‌نی‌یە لەسەر خواپەرستی بەخودانەبێ · پاشان بلێ ئەی خودا گوناهەکانم دایۆشە بەڕەحمی خۆت · یادوعابکا مەطلوبی ڕەوا دەکرێ · ئەگەر دەستنوێژیش بشوا ونوێژبکا نوێژی قبوول دەکرێ ·

٣٢٠ عن جابر ابن عبدالله ( رض ) عنهما قال كان رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم · يعلمنا الاستخارة في الامور كلها كما يعلمنا السورة من القرآن يقول اذا هم أحدكم بالأمر فليركع ركعتين من غير الفريضة ثم ليقل اللهم اني أستخيرك بعلمك · وأستقدرك بقدرتك · وأسئلك من فضلك العظيم · فانك تقدر ولا أقدر وتعلم ولا أعلم وأنت علام الغيوب ·

اللهم ان كنت تعلم ان هذا الامر خير لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري · أو قال عاجل أمري واجله فأقدره لي ويسر لي ثم بارك لي فيه · وان كنت تعلم ان هذا الامر شر في ديني ومعاشي وعاقبة أمري · أو قال عاجل أمري وآجله · فأصرفه عني وأصرفني عنه وأقدر لي الخير حيث كان ثم أرضني به قال ويسمي حاجته ·

( تەرجەمە )

٣٢٠ دەگێڕنەوە لەجابری کوڕیعبدالله - ڕەزایخودای لێبێ - گوتی پێغەمبەر ( د ) · لەهەموو کاروبارێك فێری ئێمەی دەکرد نوێژو دوعای ئیستیخارە ( یەعنی داواکردنی باشترینی یەك لەدووشت ) · وەکوو فێرکردنی سوورەتێکی قورئان · دەی فەرموو وەکوو یەکێکتان ویستی کارێك بکات بادوورکعەت نوێژبکات لەغەیری نوێژی فەرز یەعنی ( قەضایلەسەرنەبێ ) · پاشان بلێ اللهم انی ···· هتد · ) یارەبی داوا دەکەم لەتۆ دیار کردنی ئەوشتە باشترە بۆ من · بەگەورەیی صفەتی زانینست وەداوا دەکەم لەتۆ تواناو قودرەت بەگەورەیی صفەتی توانات· وە ڕجا لەاحسانی عەزیمی تۆ دەکەم چونکی قودرەتو تەوانایی ئینتۆیە · من هیچ - قودرەتم نییە · وە زانین ئینتۆیە منهیچ نازانم تۆ زانای بەهەمووشتی بزر لەئێمە · ئەی خودایە ئەگەر دەزانی ئەمکارە ( لێرە دەبێ

ناوی‌شته‌که‌ش بینی · یه‌عنی ده‌بی بڵێی ئه‌م‌ژن‌هێنانه یا ئــه‌م ســه‌فه‌ره·
یا ئه‌م موعامه‌له‌یه پاشتره بۆمن له‌خصــوص دینم وه مه‌عیشــه‌ت‌و حــه‌یاتم
وه‌ئه‌نجامی کارم · یاخۆ فه‌رمووی · ده‌رباره‌ی کاروباری قیامه‌تم بۆم
دیاربکه‌ی ئێســتا · ئــه‌وی ئه‌زه‌لــه‌ن ته‌قــدیرت کردووه ( چونکی ئه‌وی
تۆدات‌ناوه ناگۆڕێ دوعای گۆڕان ناکه‌م ) وه بۆشیم ئاسان بکه‌ی پاشــان
بۆم‌به‌خێرو به‌ره‌که‌ت بکه‌ی · وه‌ئه‌گه‌ر ده‌شزانی که‌ئــه‌م‌کاره ( یه‌عنی ئــه‌م
ژن‌هینانه یائه‌م سه‌فه‌ره· خراپترینی کارێکه له‌دینم‌و له‌مه‌عیشه‌تم‌و ئه‌نجامی
کارم ) · یاخۆفه‌رمووی ده‌رباره‌ی کاروباری دونیاوقیامه‌تم · ئــه‌م کار
که‌ژن‌هێنانه یاهــه‌رچی هه‌یــه · له‌منی لاده منیش له‌ئــه‌و لاده · خێــرو
به‌ره‌که‌تم بۆدیاربکه · له‌هه‌ر جێگایه‌که له‌سه‌ر موافقه‌ی ته‌قدیرو دانانی
خۆت · پاشان ڕازیشم بکه‌ی به‌ئه‌و · ناوی پێسویستی‌یه‌که‌بینی له کاتی
دوعا له‌جیاتی ان هذا الامر بــلێ ( ان هذا النـكاح أو الســفر ) مثــلا ·
هه‌رچلۆنێکی له‌ته‌رجه‌مه‌دا نووسیومانه ·

« ده‌باره سونه‌نی »

پێش نوێژی ڕۆژئاوا ( مه‌غریب )

٣٢١ عن عبدالله المزني ( رض ) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال صلوا قبل صلاة المغرب · قال في الثالثة لمن شاء كراهية أن يتخذها الناس سنة ·

( تــه‌رجــه‌مــه )

٣٢١ ده‌گێرنه‌وه له‌عبدالله‌ی موزني ــ ڕه‌زای خودای لێ‌بی · ئه‌ویش

لەپێغەمبەر ( د ) دەگێڕیتەوە فەرمووی دووڕکعەت نوێژبکەن لەپێش نوێژی مەغریب سێجار وای فەرموو · لەجاری سێیەم فەرمووی بۆ هەرکەسێك حەزدەکا · ئەوەك خەڵکی بیکێڕن بەسـونەتێکی لازمومۆکـەدە · دەوامی لەسەر بکەن ·

( ش ) : ئیمامی ئەوەوی تەصحیحی کردووە سونەتە · ئیمامی مالك گوتیتی سونەت نی‌یە ئیمامی ئەحمەد گوتیتی جـائزەو سـونەتـە لـە پێش نوێژدابەستن ( قامـەت ) · بەڵام لـەپاشی دەسـت‌کردن بە ( قامـەت ) مەکروهە ·

بێژراویشە مەکرووهە ئەمە مەردوودە واتە بەڕاست نەزانڕاوە ·

## « باب فضل الصلاة في مسجد مكة والمدينة »

### باسی گەورەیی نوێژلەمزگەوتی مەکەو مەدینەی پیرۆز

٣٢٢ عن أبي هريرة ( رض ) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم · قال لا تشدوا الرحال الا الى ثلاثة مساجد · المسجد الحرام ، ومسجد الرسول ، والمسجد الاقصى ·

( تـەرجـەمـە )

٣٢٢ دەگێڕنەوە لەئەبوو هوڕەیرە – ڕەزای خودای لێ‌بی · ئەویش لەپێغەمبەر ( د ) دەگێڕیتەوە فەرمووی · بارخانەی سەفەر قایم ناکری ·

واته سه‌فه‌ركردن هه‌لنابژردرێ بۆ نوێژكردن له مزگه‌وتێك ياله‌جێگايێكی تر ٠ مه‌گه‌ر بۆ سێ‌مزگه‌وت نه‌بێ ٠ يه‌كه‌م : كه‌عبه دووه‌م : مزگه‌وتی پێغه‌مبه‌ر له‌مه‌دينه ٠ سێيه‌م : مزگه‌وتی قودس ٠

( ش ) : استدلال كراوه به‌م حه‌ديثه ئه‌گه‌ر كه‌سێك نه‌در بكا بچێته يه‌كێك له‌م‌سێ‌مزگه‌وته لای ئيمامی مالكو ئه‌حمه‌دو شافعی ٠ واجب ده‌بی ده‌بێ‌بچی ٠ به‌لام له‌كتابی ( أ م ) ئيمامی شافعی فه‌رمويتی هه‌ربۆمسجد الحرام واجب ده‌بێ له‌به‌ر ته‌عه‌روقی نوسوك به‌وێ ٠ بۆ دوو مزگه‌وته‌كانی تر‌واجب‌نابێ ٠ئيمامی ئه‌عظه‌ميش كوتيتی واجب نابێ مطلقا ٠ استدلايشی كراوه دووباره ئه‌گه‌ر كه‌سێك له‌سه‌ر خۆی نه‌ذر بكا بچێته‌مزگه‌وتێك ٠ له‌غه‌يری ئه‌م‌سێيانه واجب نابێ له‌سه‌ری چونكی هيچ كامێكيان گه‌وره‌ترنين له‌هيچ‌كا مێكين ٠ ئنجاله‌هه‌ر مزگه‌وتێك له‌پووپی عارد نوێژبكا كافيه ٠ ئه‌م‌حه‌ديثه قسه‌ی ئه‌وانه به‌تال ده‌كاته‌وه ده‌كوتيويانه : قه‌ده‌غه‌يه سه‌فه‌ركردن بۆ داوای عيلمو زياره‌تی شێخانو قه‌بری پێغه‌مبه‌ران هه‌تا بۆزياره‌تی قه‌بری پێغه‌مبه‌ريش ٠ ( د ) له‌مه‌دينه‌ی‌پيرۆز عه‌مه‌ليان به‌ظاهر كردوده قسه‌يان مه‌ردووده ٠ چونكی سه‌فه‌ری طالبی‌عيلمو زيارمتو ئه‌وانی تريش بۆ نوێژنيه ٠ به‌لكی به‌سودوه‌رگرتن له‌زانينه يابۆئه‌وشته‌يه كه‌له‌و جێگايه هه‌يه والحاصل ئه‌م حه‌ديثه تايبه‌ته به‌نوێژ ٠

٣٢٣ عن أبي هريرة ( رض ) أن ألنبي صـلى ألله تعالى عليه وسلم قال ٠ صلاة في مسجدي هذا خير من ألف صلاة فيما سواه ٠ الا المسجد الحرام ٠

( تەرجەمە )

٣٢٣ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بی بەڕاستی پێغەمبەر ( د ) فەرمووی نوێژێك لەم مزگەوتی من ـ ئەمە یەعنی مزگەوتی مەدینە ـ باشترە لەڕووی پاداشت فەك لەڕووی صحەتەوە لەهەزار نوێژ لەغەیری ئەم مزگەوتە لەمسجدالحرام نەبێ لەمەکە چونکی لای [ بزارو طبرانی ] لەحەدیثی ابو الدرداء ریوایەت کراوە ( الصلاة في المسجد الحرام بمائة الف صلاة ) والصلاة في مسجدى بألف صلاة والصلاة في بيت المقدس بخمسمائة صلاة ) ٠

٣٢٤ عن أبي هريرة ( رض ) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم قال ٠ مابين بيتي ومنبري روضة من رياض الجنة ومنبري على حوضي

( تەرجەمە )

٣٢٤ دەگێڕنەوە لەئەبووهورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بی ئەویش لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە فەرمووی مابەینی خانووی‌منو مینبەری من مێرگێکە لەمێرگەکانی بەهەشت وەمینبەری منیش بەعەینی خۆی لەسەر حەوزی منە مەعنا لەسەر ڕووباری کەوشەرە لەبەهەشت ٠

[ یەعنی ئەم‌مینبەرە لەسەر حەوزی‌من نی‌یە کەلەڕووباری کەوثەر ئاوی بۆدێ لەطەرەف ڕووبار واقع بووە یاخۆمینبەرێنی بۆ لەسەر حەوزەکە دادەندرێ دەعوەتی خەلکی لەسەر دەکا هەروەکوو حەدیثی نسائی فەرموویتی ٠ ومنبري على ترعة من ترع الجنه ] ( ترع ) ٠ بەمەعنا حەوزە ٠

## « باب الاستعانة في الصلاة »

### باسي داواي يارىدەبەدەست لە نوێژ

**٣٢٥ عن عبدالله ابن مسعود ( رض ) قال ، قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • ان في الصلاة شغلا**

( تــەرجــەمــە )

٣٢٥ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعوود ڕەزای خودای لێ بێ • پێغەمبەر (د) • لەنوێژدا هەرجــارە ئەگەر ســەلامان لێبکردایە جوابی سەلامی ئێمەی دەداوە • پاشان وەکوو لەهیجرەتی حەبەشە لای نەجاشــی گەڕاینەوە سەلاممان لێ کرد • بەلەفظ وەلامی ســەلای ئێمــەی نەداوە • بەئیشارەی دەست جوابی سەلامی داوە • وەکوو لەنوێژ بۆو • فەرمووی لە نوێژدا مەشغەلەتێکی زۆر گەورە هەیە • کەخەریك بوونە بەموناجــاتی خودا لەڕیوایەتێك لەزەیدی کوڕی ئەرقــەم دەگێرنەوە ـ ڕەزای خــودای لێ بێ ـ گوتی ئێمە پێشدان لەنوێژ قسەی عادەتیمان دەکرد هەتا نازلبوو ( حافظوا على الصلوات والصــلاة الوســطى • وقوموا للــه قانتين ـ أي ساكتين • وقيل خاشعين ) • ئنجا ئەمری بەئێمــە فــەرموو بەســكوت ( شرقاوي ج ٢ ص ٢١ ) •

**٣٢٦ عن معيقيب ( رض ) قال ، قال النبي صــلى الله تعالى عليه وسلم في الرجل يسوي التراب • حيث يسجد • ان كنت فاعلا فواحدة •**

( تـەرجـەمـە )

٣٢٦ دەگێڕنەوە لەموعیقیب - ڕەزای خودای لێبێ - پێویێ لەنوێژ خاکوخۆلی ڕێك دەخست بەجێگای سـەجدەی پێغەمبەر ( د ) فەرمووی ئەگەر جێسەجدەت هەر ڕێك دەخەی بەیەك جوولانی دەست ڕێکیبخە نەك بەجوولاندنەوەی زۆری دەست ٠

٣٢٧ عن عائشة ( رض ) قالت ، قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم انهما آيتــان من ايات الله فاذا رأيتم ذلك فصلوا حتى يفرج عنكم لقد رأيت في مقامي هذا كل شيء وعدته حتى لقد رأيت أريد ان آخذ قطفا من الجنــة ٠ حين رأيتموني جعلت أتقــدم ولقد رأيت جهنم يحطم بعضها بعضــا حــين رأيتموني تأخرت ورأيت فيهــا عمــرو ابن لحي وهــو الذي ســيب السوائب ٠

( تـەرجـەمـە )

٣٢٧ دەگێڕنەوە لـەحـەزرەتی عائشـە - ڕەزای خـودای لێبێ - پێغەمبەر ( د ) فەرمووی ئـەم ڕۆژگیـرانو مانـگ گیرانە دوونیشـانەن لەنیشانەکانی خودای گەورە ٠ وەکوو چاوتان بەشـتێك لەمانـە کەوت نوێژبکەن هەتا دەبنەوە بەڕاستی دیتم لەم جێـگایەی خـۆم لەنوێـژی

ڕۆژگیران هەرشنێکی کە بەلێنم پێدرا هەتادیتم کەویستم ووشــووە
ترێیەك لەبەهەشـــت لێبکەمـــەوە وەکــوو منتـــان دیت پێش کـــەوتـــم
بۆلێکردنەوەی پاشان ئیزن نەدرام بەڕاستی جەهەنەمیشم دیت لەبـــەر
زۆرگەرمی هەنـــدێکی هەنـــدێکی دەهـــاڕی ووردەکـــرد وەکومنتان دیت
خۆم کێشایەوە پاش وە دیتم لەناو جەهەنەم عەمری کوڕیلوحەی ئەوبوو
قوربانیو کوشتنەوەی ووشترانی کردە عادەت بۆ بوتو صەنەم ٠

۳۲۸ عن جابر ( رض ) قال ، قال النبي صلى الله تعالى عليه وســـلم انما منعني أن أرد عليك اني كنت أصلي ٠

( تـــەرجـــەمـــە )

۳۲۸ دەگێڕنەوە لەجـــابری کوڕی-عبداللـــە ڕەزای خودایـــان لێبی
گوتی پێغەمبەر ( د ) بەئیشێکی ناردم لە غـــەزای بـــەنی موصطەلەق
منیش چووم ایشەکەم پێك هیناو هاتمەوە چوومە خدمەت پێغەمبەر ( د )
سەلامم لێکرد ٠ جوابی نەدامەوە لەدلی خۆم عاجز بووم زۆر ٠ لەدلی خۆم
گوتم دەبێ درەنگ هاتیمەوە بۆیی لێم عاجزبوو ٠ دووبارە سەلامم لێکرد٠
دووبارە جوابی نەدامەوە عاجزبوونێکی بێئەندازە لەجاری پێشوو زیاتر
ڕووی تێکردم ( پێغەمبەر ئەگەرچی بەئیشارەی دەست جوابیداوە بـــەلام
جابر تێنەدەگەیشت بۆیێ عاجزبوو ) پاشان ئەم جارەش سەلامم لێکرد
وەلامی داوە فەرمووی بۆیێ جوابی سەلامم نەداوە بەزمـــان چونکی نوێژم
دەکرد ٠

# « باب السهو في الصلاة »

## باسی سەهو لەنوێژ

٣٢٩ عن عبدالله ابن مسعود : قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ماذاك . وفي رواية أبي هريرة أحق مايقول .

( تەرجەمە )

٣٢٩ دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعورد ڕەزای خودای لێبی پێغەمبەر ( د ) . نوێژی نیوەڕۆی پێنجڕ کعەتکرد . عەرزی کرد . ئەرێ نوێژ زیاد کراوە . فەرمووی چیبووە بۆچ ئەم پرسیارە دەکەن گوتیان تۆپێنج ڕکعەتت کرد . ئنجا لەبەرسەهو دووسەجدەی برد وەکووسەجدەی نوێژ لەپاشسەلام دانەوە وە لەپاش قسەکردنیش .

( ش ) : سەجدەی سەهو لای جمهور سونەتە لای حەنەفی فەرزە . پاشان حەنەفیاستدلالی کردووە بەم حەدیثە کەسەجدەی سەهو لەپاش سەلامەمطلقا لای هەندێکیش ئەگەر سەهو بەنوقصانبی سەجدە لەپێشسەلامە لەبەر حەدیثی عبداللەی کوڕی بوحەینە . ڕەزای خودای لێبی : گوتی پێغەمبەر لەنوێژی نیوەڕۆ التحیاتی پێشووی بەسەهو تەرككرد وەکوونوێژی تەواوکرد لەپێشسەلام . سەجدەی برد لەپاشان سەلامی داوە . ئەگەر سەهو بەزیادەشبی لەپاشسەلام سەجدە دەبردرێ

وەکوو ئێرە • مالك • وەموزنی وە قەولی قەدیمی شافعی لەسەر ئەم قسەن بەلام قەولی جەدیدی شافعی • مطلقا سەجدەی سەهو لەپێش حەدیثی ئەبی سعید ڕەزای خودای لێ بی لای مسلم [ اذا شك احدكم في صلاته فلم يدر كم صلى فليطرح الشك وليبن على ما استيقن ثم يسجد سجدتين قبل ان يسلم • ] • ئەم حەدیثەی مسلم دەلالەت دەکاکەدەبی سەجدی سەهو لەپێش سەلام بی باسەهوبەزیادەش بی کورت کردنەوە هەلبژاردرا • ئەگەر نا درێژە پێدان ( تەفصیلات ) زۆرە •

شرقاوی ( ج ٢ ، ص ٢٣ ) •

## ٣٣٠ عن أم سلمة ( رض ) قالت ، قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • يا بنت أبي أمية سألت عن الركعتين بعد العصر وانه أتاني ناس من عبدالقيس فشغلوني عن الركعتين اللتين بعد الظهر فهما هاتان •

( تەرجەمە )

٣٣٠ لە ئومی سەلەمە دەگێڕنەوە ـ ڕەزای خودای لێ بی • گوتی پێغەمبەر ( د ) نەهی لەدوو ڕکعەتی پاش عەصردەکرد • پاشان دیتم خۆی دەی کرد • هەندێ ئافرەتی ئەنصاریانم لابوون • جاریەی خۆم ناردە لای • گوتم بچۆ لەتەنیشت ئەو ڕاوەستە • پێی بلێ ئوم سەلەمە عەرزت دەکا • کەمن خۆم لەپێغەمبەرم بیست • نەهی دەکرد لەدوو ڕکعەتی پاشی عەصر ئێستا دەبینم دەیانکەی •

ئەگەر بەدەست ئیشارەشی بۆکردی کەبکشییەوە بکشێوە ٠ـ جاریەکە چوو ٠ بەئیشارە فەرمووی بکشێوە کشایەوە ٠ پاشمار وەکوولەنوێژبۆوە فەرمووی ئەیکچی ئەبی ئومەیە ( کەناوی سوحەیل بوو یاخۆ حوزەیفەبوو کوڕی موغیرەیمەخزوومی ) سؤالت لەم دوو ڕکعەتانەش کرد کەلەپاش عەصرکردم ٠ ئەمە چەندکەسێك لەقەبیلەی عبدالقیس هاتنەلام ٠ منیان مەشغوول‌کرد لەدوو ڕکعەتی پاش نیوەڕۆ ٠ ئەمە ئەم دووڕکعەتانەبوو ئێستاکردم ٠ چونکی پێغەمبەر (د)عادەتی وابوو ئەگەر شتێکی بکردایە لەطاعەت (خواپەرستی) بەقەطعی تەرکی‌نەدەکرد ٠

## ( باب في الجنائز )

## باسی جەنازە

**٣٣١ عن أبي ذر ( رض ) قال ، قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ أتاني آت من ربي فأخبرني أو قال بشرني انه من مات من أمتي لا يشرك بالله شيئاً دخل الجنة ٠ قلت وان زنى وان سرق ٠ قال وان زنى وان سرق ٠**

## ( تەرجەمە )

دەگێڕنەوە لەئەبوو ذەر جەندەبی کوڕی جەنادە ـ ڕەزای خودای لێبی ـ گوتی پێغەمبەر(د) فەرمووی ٠ یەکێك لەلایەن خوداوە لەخەودا

هاتەلام کەجوبرائیل‌بوو خەبەری پێدام • یاخۆ فەرمووی مـوژدەی پێـدام کەبەبێ‌شك هەرکەسێك مرد لەئومەتی من هیچ شتێکی نەگێرابی بەشریکی خودا • ( مەعنا مووەحیدێکی بەڕاست‌بی ) دەچێتە نـاو بەهەشت • ئەبـوو ذەڕ‌گوتی ئەگەر زناو دزیشی‌کـردبی • فەرمووی بازناو دزیشی کردبی •

(ش) بەباسی‌زنا ئیشارەی‌وەبال‌حەقی خودا کـرد • بەباسی دزیـش ئیشارەی وەبال حەقی خەڵك‌و عباد کـرد • بـەلام ئەمەی کە قەواعیـدی شەرع ــ بڕیاری لەسـەر داوە • مـافی خـەڵکی بەمـردن لەسـەرئیمان ساقط‌نابی • لازمیش ناکاکە ساقط نەبی خودا کەفالەتی حـەقی عەبـدان نەکا لەوکەسەی کەئیرادەی کردووە بیباتە بەهەشت • بۆیێ پێغەمبەر(د) بەدوور زانینی ئەبوذەری ڕەد کردەوە یاخۆمەبەست لەچوونە ناوبەهەشت • موطلەقی مورادە ( یەعنی چی‌پێش عەزاب چی‌پاش‌عەزاب ) لـەم حەدیثـە دەلالەت هەیە کەکەبائر واتە گوناهی گەورە • سـەلبی ئیمان ناکـا • وە ئەو کەسەی باوەڕیشی‌نی‌یە بەیەکایەتی خودا ناچیتـە بەهەشت لەسـەر قسەی هەموولایەك • وەگوناهی گـەورەش خواپەرسـتی‌و طاعـەت ڕەش ناکاتـەوە •

شرقاوی : ج/٢ : ص/٢٤

**٣٣٢ عن عبد الله ( رض ) قال رسول الله صلي الله تعالى عليـه وسلم • من مات يشرك باللـه شيئاً دخل النار •**

( تەرجـەمە )

٣٣٢ دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ‌بی پێغەمبەری خودا (د) فەرمووی · هەرکەسێك مرد · شـتێکیشی گێرابی بەشـریکی خودا · دەچتە ناوئاگر عبداللەی کوڕی مەسعود گوتی منیشی‌لەم حەدیثەم وەرگرت : گوتم : من مات لایشرك بالله شیئاً دخل الجنة : واتـــە هەرنەسێك هـاوبەشی بۆخـودا نەدۆزیبێەوە بـاش مـــردن دەچیتـە بەهەشت · چونکی لەغەیری ئەم دووجێگایە جێگایـەکی · تر نی‌یە · وە نەهلی ئەعرافیش لەدوایی هەردەچنەبەهەشت ·

٣٣٣ عن أم العـــلاء · رض اللـــه تعالى عنها قالت قال رسول الله صلي اللـــه تعالى عليه وسلم · ومـا يدريك ان الله اكرمه · أما هو فقد جاءه اليقين واللـه اني لأرجو له الخير · والله ما أدري وانا رسول اللـه ما يفعل بي ·

( تەرجـەمە )

دەگێرنەوە لەأمی علاء کچی حـارث‌کوڕی ثابـت ئاضـرەتێك بـوو لەئەنصار · ڕەزای خودای لێ‌بی · گوتی وەکوو ئەهلی مەکە هیجرە تیان کرد بۆمەدینە · بە قورعە موهاجر دابەش‌کران لەسەر ئەنصار · عوسمانی کوڕی مەظعون بەبەرمن‌کەوت · لەخانوەکـانی خۆمـان دامـان بـەزاند · ئەمساغ‌کەوت وەفاتی کرد · شووراو کفن کرا لە جلکی خـۆی پێغەمبەر(د)

هاتەسەر جەنازەی · منیش گوتم ڕەحمەتی خـودا لەسـەر تۆبی ئـەی ئەبالسائب ( کونیـەی عوسمان‌بوو · من‌شـاهدتم بۆتۆ خودا ڕێزی گرتی بێشك · پێغەمبەر(د) فەرمووی لەکوێ‌تزانی · خودا ڕێزی‌گرت منیـش گوتم باوکو دایکم بەفیدات ئەی پێغەمبەری خودا · کەخودا ڕێزی ئەمـە نەگری کێ‌هەیە ڕێزی بگری · فەرمووی ( أما عثمان ) یەقین‌بکە کەمردنـە گەیشتە ئەو واللەمن بۆئەو ئومێدو ڕجـای چاکـەم هـەیە · وە بەحـەقی خوداش من‌نازانم کە پێغەمبەری خوداشم چی‌لەمن دەکا چی‌لەئێوەش دەکا·

(ش) لەسوورەی ئەحقافیش موافقی ئێرە ئەم‌ئایەتە هاتە خـوارێ · [ لا أدری مایفعل بی ولابکم ] · لەمەکـە نەیدەزانی خـودا چی‌لێ‌دەکـا · پاشان وەکوو سوڕەی فەتح هاتەخوارێ لەمەدینە بەئایەتی [ لیغفر لك الله ماتقدم من ذنبك وماتأخر ] · لە حـالی خـۆی گەیشت · ئنجـا ام العـلا· فەرمووی قەسەم بەخودا نابێ لەمەپاش نابی تەزکیەو تەبریەی کەسێك‌بکەم بەقەطعی ( ببیرای بیرای ) · لەمەوە وەرگیرا بەهیـچ‌کەسێك ناگـوترێ بێشك دەچتەبەهەشت · مەگەر تایبەت کـرابی لەلایەن دانەری شـەرع وەکوو عەشەرەی موبەشـەرە · بەتایبـەتی ئیخـلاص‌و باوەڕی ئەمرێـکی قەلبی‌یە لەدڵی ئەوکەسەیە خودانەبی کەس نازانی ـ واللـە اعلم بمـا فی نفوسـکم ـ

## ٣٣٤ عن جابر ( رض ) تبکین اولا تبکین · مـا زالت الملائکة تظلله باجنحتها حتی رفعتموه ·

( تەرجەمە )

دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری ـ ڕەزای خوای لێبی ـ گوتی وەکوو باوکم عبداللەی کوڕی عەمر ـ لەغەزای ئوحود شەهیدکرا • لەمانگی شەوال ـ لەتەئریخی سی۳ی‌هیجری • ڕووپوشم سەرڕووی هەلدەداوە ودەگریام • دانیشتوەکانیش پێیان‌دەگوتم مەگرێ : پێغەمبەر(د)وەکوو داینشتوەکان نەی فەرمەود هەکرنی • پووریشم فاطمە کەخوشکی لەدایك‌وبابی باوکم‌بوو • دەگریاپیغەمبەر(د) فەرمووی بە ( تەعزیە ) ئەی فاطمە بگرییی یاخۆ نەگریێ • مەلائکە بۆسێبەرلێ‌کردنی بەباڵەکانی خۆیان لەسەر ئەو ڕاوەستاون بۆئەگۆڕانی بێنی • وەموژدە بەڕێزگرتنی خودا لەئەو وەبۆ بەرزبوونەوەی ڕووحی‌هەتا هەلی دەکرن •

(ش) پێغەمبەر(د) ئەم خەبەردانەی بەڕێگەی وەحی‌بوو • کەوایە منافات لازم نایە ( واتە دژی‌یەکی‌نی‌یە ) • لەگەل حەدیثی أم‌العلاء • لەپێش ئەم حەدیثە چونکی بەوەحی خەبەری پێ‌نەدرابوو لەبەر ئەمە کەلەجهاد شەهید نەکرابوو • عثمان کوڕی مەظعون • بەلام عبداللەشەهیدکرا •

٣٣٥ عن أنس ( رض ) قال : رسول اللـه صلي الله تعالى عليه وسلم • أخـذ الراية زيـد فأصيب ثم اخذها جعفر فأصيب • ثم اخذها عبدالله ابن دواحة فأصيب • وان عيني رسول الله صلي الله تعالي عليه

وسلم . لتذر فان . ثم اخذها خالد ابن الوليد من غير امرة . ففتح له .

( تەرجەمە )

(٣٣٥) دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێبێ پێغەمبەر (د) لەشکرێکی ڕێکخست لەسی ٣ هەزار کەس . بۆ سەر ڕۆم . لەژێر سەرکردایەتی زەیدی کوڕی حارثە . وە جەعفەری کوڕی ئەبوطالبی . وعبداللەی کوڕی ڕەواحە . یەك لەدوو یەك . خالدی کوڕی وەلیدیش کەتازە موسوڵمان ببوو بەهەوەسی خۆی بەگەڵ کەوتبوو . لەمانگی جماذالاولی لەسالی هەشتی هیجری [٦٢٩] میلادی ئالای بەزەیدی کوڕی حارثەدا . فەرمووی ئەگەر زەید شەهیدکرا . ئالا بدرێتە جەعفەر ئەگەر جەعفەر شەهیدکرا . بەیداغ بدرێتە عبداللەی کوڕی ڕەواحە . پێغەمبەر(د) لەشاری مەدینە . پێی ڕاگەیاندن ژن ومندال و پیەك کەوتووان مەکوژن . خانوان مەڕووخێنن . وەدارو درەخت مەبڕن . پێغەمبەرو خەڵکی مەدینە دوعایان بۆکردن گوتیان : ( صحبکم الله ودفع عنکم وردکم الینا سالمین ) . واتە خواتان لەگەل . خوابەسەرتان بخا وبەسەلامەتی بۆمان بگەڕێنەوە ) . ئنجا ئەوسێ ئەمیری ناوبراوو لەشکر . هەربیریان لەوە دەکردەوە . کە لەئاکاو بەسەر دوژمندا بدەن بێ ئاگابوون لەوە کەڕۆم چونکی ترسی لەشکری ئەصحابیان هەبوو لەپێش ئەوان لەشکرو استحکاماتێکی زۆریان لەشام حازرکردبوو . لای هەندێ ریوایەت ـ میرەقل بەسەدهەزارکەسی لەڕۆم لەعاردی ـ بەلقا ـ لە ـ مەئاب ـ دابەزیبوو صەد هەزالی تریش لەهەشائری ئەترافی شام وەکوو ـ لەخمو جوذام قەبن و بەهراو بەلی .

بەگەلیان کەوتبوون · لایەهەندێ ریوایەتیش ( تیۆدۆر )ی برای میرەقیش قائدی لەشکر بوو · هیرەقل نەبوو · لەشکری ئەصحاب کەیشتنە مەعان خەبەری کۆبوونەوەکانی ڕۆمیان پێگەیشت · کەوتنە بیرکردنەوەو لێکدانەوە کەچی بکەن · بەسێ هەزارکەس لەگەل [۲۰۰۰۰۰]دووسەد هەزارکەس دووشەو لەمەعان مانەوە هەندێووتیان یا کاغەز بۆپێغەمبەر بنووسین یاخۆئیمدادمان بۆبنێری · یاخۆ هەرچی ئەمر دەکا وابکەین عبداللەی کوڕی ڕەواحەش گوتی · ئەی قەوم قەسەم بەخودا · ئێوە کەلە وەتەنونیشتمانی خۆتان هاتونەتە دەرێ · بۆشتێك هاتوونە بەهەوەس کەشەهیدبوونە · دەبینم ئێستا ـ مەطلوبەکەی خۆتان دەکەڕهێنن [ واتە ویستەکەی خۆتان ناوێ ] · ئێمە بەهێزو ژمارەی زۆر شەڕناکەین بەلکی بەم دینەدەکەین کەخودا دایتی‌یە ئێمە · بەم قسەی عبداللە سەربەرزی‌یەك‌و ئازایی‌یەك کەوتە ناودڵی ئەصحاب ـ گۆتیان ڕاستدەکا ڕۆیشتن لەدێیەك ( مەشارق ) ناو لەعاردی ( بەلقا ) · لەشکری هیرەقل دابەزی بوون لەشکری ئەصحابیش چوونە مۆتە ( ئەی بۆ گەورەیی باوەڕو قووەتی‌ئیمان ) لە مۆتە ئاگری شەڕ بلێسەی بلندبوو جۆشی خوارد لەبەینی لەشکری سێ‌هەزار کەسی‌و لەشکری دووسەد هەزار کەسی‌کافر زەیدی کوڕی حارثە بەیداغی هەلگرت · مردنی خۆشی لەو مەقامەدا دەدیت · بەلام دەیزانی مردن شەهیدبوونە لەڕێگا ی دینی خودا دەشیزانی شەهیدبوون لەزەفەربردن بەدوشمن کەمتر نی‌یە کوشتارێکی زۆربێ قصوری کرد هەتا ، جەسەدی پیرۆزی بەرمی ڕۆمیان پارچەپارچەکرا · پاشان جەعفەری کوڕی ابو طالب بەیداغی لێ‌وەرگرت ئەوڕۆژە لەتەمەنی سی‌وسێ‌سالیدابوو بەلام جوانی‌و لاوچاکی بەرامبەر

ئازایەتی بوو . جەعفەر بە ئالاپەوە کوشتارێکی زۆر باشی دەکرد بەلام دوژمن عەلەبەیان لەسەر کرد چواریەلی ئەسپەکەیان بڕی . خۆی دەرەدا سەرعارد . بەپیادەدەستی بەکوشتار کرد و بەناویان کەوت لەچوستی وەکوو تیر . بریقەی شیری لەنێو تۆزدا سەری سواران وەکوو ڕونالی دارژانی ئەستێرە لەشەوی تاریك خۆی دەنواند . بەدەستیڕاستی کەئەلای هەلگرتبوو شەهیدکرا ئالای دا دەستی چەپ ئەویش شەهید کرا . بەهەردوو قۆلی ئالای هەلگرت . هەتایەتەواوی شەهید کرا .

وەکوو جەعفەریش شەهید کرا عبداللەی کوڕی ڕەواحە ئالای هەلگرت . لەسەر ئەسپ کەوتە دوودلی لەهێرش بردنەسەر کافران . چونکە جودابوونەوەی خۆی لەم حەیاتو ژیانەی ئەئێستاتێدایە لەبەرچاو دیاربوو . چیعەقلێك قبوول دەکا یەك کەس بڕەویتە ناو دەهەزار کەسی دوژمن قوتاریش ببی . هەرچەندە هەندێ دوودلی لێپەیدا بوو بەلام پاشان ئەم دووشیعری خوێندەوە وەکوتی : ـ

اقسمت يا نفس لتنزلنه

لتنزلن أو لتكرهنه

ان اجلب الناس وشدوا الرنه

مالي أراك تكرهين الجنه

مەعنــا :

یەعنی توخودا ئەی نەفس دابەزە بۆبەیداغی پێغەمبەر(د) بێ شك یاخۆدەبی دابەزی بەخۆشی خۆت یاخۆ بەتۆبزی دەبی دابەزی یەعنی بەهەر حالێك دانەبەزین مەحالە چلۆنە ئەی نەفس دەت بینموەکوو لەشکری

کافران وە نەڕەیان غەلەبەیلەسەر کـردی تۆ لەسەلطەتەتو خۆشیەکانی بەهەشت بێزاردەبی ـ لەپاش ئەمقسەیە ٠

بەشیرو بەیداغـەوە ڕووی لــەدوژمن کـرد کوشتاری کـــرد هەتاشەهیدکرا ٠ خودا بە مەرحەمەت احسانی خۆی بەشەرەفـوگـەورەیی ئەم زاتانەمان ببەخشی آمین ٠

پاشاڤ خالدی کـــوڕی وەلیـد وەکـوو تێگەیشت قـوەی مەعنەویـەی لەشکری اسلام کەوتە لەرزین ٠ هیـچ کەسـێکیش بەهـەلگرتنی بەیـداغ ڕازی نەبوو ٠ وە ئەویش ئەساسەن طالبی ناوێك بوولەئیسلام ٠ وەطالبی صحبەتیکی پێغەمبەر(د) بوو ٠ چونکی شەشێمانگ بوو موسـولمان بوبو تووشی هیچ کوشتارێك نەهاتبوو لەگەل کافران ٠ یەبداغی هەلگرت ئەوڕۆژە لەنیوەڕۆ تائێوارە نۆشیری لەدەست پسا لەکوشتاری کافران ٠ پێنچ سەد موسولمان شهیدکران ٠ کوژراوانی دوژمنیش نەهاتە حەدی ژماردن ٠

مەعنای حەدیث :

ئەنەس فەرمووی پێغەمبەر(د) لەمەدینــەوە فەرمووی زەیـد بەیداغی هەنگرت لەکاتی شەڕ شەعیدکرا پاشان جەعفەر بەیداغی وەرگرت ئەویش شەهیدکرا پاشان عبداللەی کوڕی ڕەواحە وەری گرت ئەویش شەهیدکرا ٠ فرمێسکیش لەهەردوو چاوی پیرۆزی دەڕژا خواریێ (د) ٠

## ٣٣٦ عن أنس ( رض ) قال لانبي صلى الله تعالى عليه وسلم ما من الناس من مسلم ٠ يتوفى له ثلاث لم يبلغوا الحنث الا ادخله الجنة بفضل رحمته اياهم ٠

دەگێڕنەوە لەئەنەس - ڕەزای خودای لێ بێ - پێغەمبەر(د) • فەرمووی نیەلەخەلکی هیچ موسولمانێك سێ ٣مندالی نەبالغی مردبێ مەگەربەبێ شك خودا دەیخاتە ناوبەهەشت بەچاکەو مەرحەمەتی خۆی • دەرحەق بە ئاولادو باوکەکانی یان یەعنی چوونیان بۆبەهەشت تەنیا بەمەحض فەضل و احسانە نەك بەڕێگەی وجوب بێ • یاخۆ نەك بە استقحاقی عەمەلی خۆیان بەلام بەمەرجی ڕەزا بەمردنیان •

٣٣٧ عن أم عطيه الانصارية • قالت دخل علينا رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • حين توفيت ابنته • فقال أغسلنها ثلاثا او خمسا او اكثر من ذالك ان رأيتن ذالك بماء وسدر واجعلن في الآخرة كافوراً او شيئاً من كافور • فاذا فرغتن فآذنني فلما فرغنا • آذناه فاعطانا حقوه وقال اشعرنها اياه • تعني ازاره • وفي رواية أخرى انه قال ابدأوا بميامنها وبمواضع الوضوء منها •

( تەرجەمە )

دەگێڕنەوە لەئومی عەطیەی ئەنصاری ناوی کەعب بو - ژنێك بوو مردووی دەشووشت • گوتی وەکوو زەینەبی کچی پێغەمبەر(د) • خێزانی بوالعاص کوڕی ڕەبیع دایکی ئیمامە وەفاتی کرد • پێغەمبەر(د) هاتەلامان

فەرموی ٠ زەینەبی کچی من بشۆن سێ جار ٠ یاخۆ پێنج جار ٠ یاخۆ زیاتر ٠ حەوت جار ئەگەر بەچاکتان زانی بەئاوو بە گەلاسیدر ( لەجیاتی صابونی ئەم زمانە ) ٠ بەلام لە شووشتنی دوایی بەکافوور بیشۆن ( تابێنی خۆشبیو بەدەنی توند بی ) وەکوو تەواوبوون ئاگادارم بکەن ٠ ئێمەش ئاگادارمان کرد ٠ پێغەمبەر(د) پەشتەمالی ئیحرامی خۆی بەئێمەدا –
فەرمووی بۆکچەکەم بیکەنەکراسی سەرگۆشت لە ریوایەتێکی تر ٠ پاش ئەمرەکانی پتیشووی لەشووشتن بەلای ڕاست دەستپێ بکەن ٠ هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژ بشۆن لای ئەوەوی یەك جار کافیە سی٣جارسونەتە ش:شووشتنی مردوو واجبیەكجارە لەپاش لابردنی پیسی ئەگەرهەبووسی٣جار سونەتە ٠

٣٣٨ عن ابن عباس رض اللـه عنهما قال النبي صلي الله تعالى عليـه وسلم ٠ اغسلوه بماء وسدر نفوه في ثوبين ٠ ولا تحنطوه ٠ ولا تخمروا راسه ٠ فانه يبعث يوم القيامة ملبيا ٠

( تەرجەمە )

٣٣٨دەگێرنەوە لەعبداللەی کوری عەباس ڕەزای خودایان لێ بی ٠ پیاوێك لەڕاوەستانی عەرەفە لەحەج لەسەر ووشتری خۆی بەربۆوە ٠ جێ بەجێ وەفاتی کرد پێغەمبەر(د)فەرمووی بیشۆن بەئاوو بەسیدر لەجیاتی سابوون ٠ لەناو دوو کفنی بنێن بۆنی خۆشی پێوەر مەکەن :

سەزیشی دامەبۆشن چونکی رۆژی قیامەت لەئیحرامدا بەلەپەیکەنەبەیـنە وەزیندوو دەکرێتەوە ٠

(ش) : ابن دقیق‌العید گـوتیتی ئەم‌حـەدیثە دەلیلە ئەگـەر ئـەوی لەئیحرامدابی وەفات‌بکا حوکمی احرامی بۆ دەهێلرێتەوە ٠ ئەمە مەزهەبی شافعی‌یە ٠ لای ئیمامی‌مالك‌و حـەنەفي ابقـا نـاکرێ ٠ ئـەمە موقتـەزای عقلەوقیاسە لەبەر برانەوەی عبادەت ٠ بەنەمانی‌جێگای تەکلیف کەحەیاتی دونیایە ٠ بەلام ئیمامی شافعی لەسـەر حـەدیث‌رۆیشتووە کەئەویـش ٠ لەپێشە ٠ بەگوێرەی حەدیث واجبی‌یەك‌کفنە جائز دوو ٠ ممـونەت سێ‌یە

٣٣٩ عن عبد الله ابن عمر رض الله عنهما ٠ ان عبدالله ابن أبي لمـا توفى جاء ابنه الى النبي فقـال يا رسول الله اعطني قميصك اكفنه فيه وصل عليه واستغفره له ٠ فاعطاه النبي صلي الله تعالى عليه وسلم ٠ قميصه ٠ وقال آذني أصلى عليه ٠ فآذنه ٠ فلما آراد ان يصلي عليه جذبه عمر رضي الله عنه ٠ فقال اليس اللـه نهاك ان تصلي علـى المنافقين ٠ أنا بين خيرتين ٠ فال استغفر لهـم او لا تسـتغفره لهم ٠ ان تستغفر لهم سبعين مـرة فلن يغفر اللـه لهم ٠ فصلى عليه فنزل ولا تصل على احد منهم مات ابـداً ٠

٣٣٩ده‌گێرنه‌وه له‌عبدالله‌ی کوڕی‌عومه‌ر ڕه‌زای خـوای لێبێ ٠
وه‌کوو عبدالله‌ی کوڕی ئوبه‌ی سه‌رۆکی منافقان له‌مانگی ذی‌العقدة
سالی(٩)نۆی هیجری له‌کاتی پێغه‌مبه‌ر(د) له‌ته‌بووک‌هاته‌وه مرد ٠
عبدالله‌که‌له پیاوه گه‌وره‌کانو هه‌لبژارده‌ی یارانی پێغه‌مبه‌ر بوو ٠ هاته
خدمه‌ت‌پێغه‌مبه‌ر (د)عه‌رزی‌کرد ـ کراسه‌که‌ی خۆتم‌بده‌ێ له‌ودا کفتی بکه‌م
وه نوێژیشی له‌سه‌ربکه ٠ وه‌داوای لێبووردنیشی بۆبکه ٠ کراسی پێدا ٠
فه‌رمووی وه‌کوو شوورا خه‌به‌رم پێبده نوێژیشی له‌سه‌ر ده‌که‌م ٠ پاشان
خه‌به‌ری‌پێدا ویستی نوێژی له‌سه‌ربکا حه‌زره‌تی عومه‌ر گوتی تۆ ئه‌مه
چی‌ده‌که‌ی ئه‌دی خودا نه‌هی له‌تۆ نه‌کردووه که‌نوێژله‌سه‌ر منافقان‌نه‌که‌ی
حه‌زره‌تی عومه‌ر ئه‌م قسه‌یه‌ی له‌م ئایه‌ته وه‌رگرت که‌ده‌لێ ماکان‌للنبی
والذین آمنوا ان یستغفروا للمشرکین ٠ هێشتا ئه‌م ئایه‌ته ـ نه‌هاتبووه
خوارێ که‌ده‌لێ ( ولاتصل علی احد مات ابدا ٠ ) پێغه‌مبه‌ر (د) فه‌رمووی
من موخه‌یه‌رم له‌به‌ینی پاڕانه‌وه بۆیانو نه‌پاڕانه‌وه بۆمنافقان ٠ خودا
ده‌فه‌رموی [ استغر لهم اولا تستغفر لهم ان تستغفر لهم سبعین مرة
فلن یغفر الله لهم ٠ ] نوێژی له‌سه‌رکرد ( پاشان ئایه‌تی ـ ولاتصل علی
احد منهم مات ابدا ) ٠ هاته خوارێ ٠ له‌سه‌ر موافه‌قه‌ی فکری
حه‌زره‌تی‌عومه‌ر ٠

٣٤٠ عن أم حبيبة ( رض ) قالت سمعت رسول
الله صلى الله تعالى عليه يقول ٠ لايحل لامرأة تؤمن
بالله واليوم الاخر ان تحد على ميت فوق ثلاث ٠ الا
على زوج اربعة أشهر وعشراً ٠

( تەرجـەمە )

٣٤٠ ەگێڕنەوە لەدایکی ئیمانداران • ئومی حەبیبە [ارملة]ناو • گـوتی بیستم لەپێغەمبەری خودا (د)دەی فەرموودروستنی‌یە بوهێچ ئافـرەتێك کەباوەڕی بەخوداو ڕۆژی قیامەت‌هەبێ • شین‌و تازیە دابگرێ لەسی٣رۆژ زیاتر • مەگەر ئافرەتێك مێردی مردبێ • بۆی هەیە چوارمـانگ‌و دەڕۆژ شـین • رابگری •

(ش) : تەقییدو بەسننەوە به باوەڕی‌و ئیمان لەبەر عادەت‌ونەریتە • ئەگەر نا لەسەر ئافرەتی ذمیەومعاهدەو مستأمنەش واجبە ئەم آحدادە • ( احداد ) لەزمانی عـەرەبی بەمەعنـا تـەرکی زینـەتە • بـەلام ئـەبوو حەنیفە گوتیتنی واجب‌نی‌یە لەسەر ژنێ کەجولەکەبێ یان دیان‌بی بەڵـکی تایبەتە بەئیسلام • بەلام ژنێك ئەگەرمێردی مـرد سـکی‌هەبوو – واتـە حەملی – هەبوو کەتای سکەکەی دانا احداد نامینێ •

٣٤١ عن أنس (رض) قال النبي صـلى الله تعالى عليه وسلم • اتق الله واصبري • انما الصبر عند الصدمة الاولى •

( تەرجـەمە )

٣٤١ دەگێڕنەوە لەئەنەسـی کـوڕی‌مالك ڕەزای خـودای لێ‌بی • پێغەمبەر(د) • بەلای ئافرەتێکدا ڕەت‌بوو • لەسەرقەبرێك بوو دەگـریا • فەرمووی ئەی ئافرەت لەخودا بترسێ • خۆت ڕابگرە بەرامبـەر ئـەوەی

خوا داناوه ئاقرەتەکە پێغەمبەری نەناسی • گوتی برۆ یەقەم بەردە •
نۆ تووشت نەهاتووەئەو مصیبەتی بەسەرمن هاتووە • پاشان یەکێك
پێی گوت ئەمەپێغەمبەربوو ــ ئەم قسەیوا رەقت بێ گوت • بەئازایی
بۆمالی پێغەمبەر چوو • ترس وهەیبەتەکی لەناودڵی پەیدابوو • لای وابوو
ئەویش وەکووپاشایان فەراش و دەرگەوانی لەپێش دەرکە راوەستاون
وەکووچووهیچ دەرگەوانەکی نەدیت گوتی قوربان عوزرم قبوول بکە •
من تۆم نەناسی پێغەمبەر(د) فەرمووی صەبروئارامی تەواو ئەوئارامەیە
لەئەوەلی هاتنی مصیبەتە • چونکی کت وپڕ دێتە سەر دلی ئینسان ئنجا بەم
صەبرو خۆراگرتنە موستەحەقی پاداشتی زۆر دەبی • چونکی عادەتە
ئینسان بەتێپەڕ بوونی کات بەطەبیعەتی خۆی ئەهوەن دەبیتەوە پاداشتی
ئارام گرتنی لەیەکەم کاتی هاتنی مصیبەت وەکوو ئەوەل نی یە کەپاش
تێپەڕ بوونی ماوەیەکی زۆر دەبی • لەبەرامبەر عوزرخواستنەوەی ئافرەتەکە
ئەم وەلامەی داوە : خۆی لەمەعزدرەت نەگەیاند گۆیابەزمانی رەووشتی
گەورەی خۆی تێی گەیاند ـ مزلەسەر خودا نەبی رقم نابیتەوە ئنجاواز
لەاعتذار بێنە • تەماشای پەرژەوەندی حالی خۆت بکە کەئارام گرتنە
بەرامبەر ئەوەی کەخودا دای ناوە •

(ش) استدلال کراوە بەم حەدیثە دروستە زیارەتی قەبران بۆپیاوو
ئافرەت ئیمامی نەوەوی گوتینی بۆپیاوان سونەتە بۆ ئافرەتان مەکرووهە •
بەمەرجێك لەزیارەتەکەیان گوناحێك پەیدانەبی ئەگەرنا حەرامە جمهوریش
لەسەرئەم قسەن •

## ٣٤٢ عن أسامة ابن زيد • رضي الله عنهما قال النبی صلی الله تعالی علیه وسلم • ان لله ما أخذ وله

ما أعطى • وكل شيء عنده بأجل مسمى فلتصبر ولتحتسب • هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده وانما يرحم الله من عباده الرحماء •

( تەرجەمە )

٣٤٢ دەگێرنەوە لەئوسامەی کوڕی زەید – ڕەزای خودای لێ بی – گوتی زەینەبی کچی پێغەمبەر (د) ناردیە لای باوکی کەکوڕێکم لەمردنە حەزدەکەم تەشریف بفەرموێتە لامان پێغەمبەر فەرمووی سەلامی پێ بکەینن • پێی بڵێن بۆخودایە ئەوی کە بی با • بۆئەویشە ئەوی کەبیدا • بۆهەموو شتێکیش لای ئەووەختێکی موعین و دیارکراو هەیە• ئنجا باصەبر بگری • مەبەستیشی لەصەبرەکە ڕەزای خودایێ دووبارە زەینەب هاتەوە بۆخاتری خودا هەردەبی تەشریف بفەرموێ پێغەمبەر(د) هەڵستا • سەعدی کوڕی عوبادەو مەعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابت و چەندپیاوی تری لەگەڵدابوو • تەشریفی چوو کوڕەکەیان هینا خدمەت پێغەمبەر(د)• لەباوەشی یان دانا • لەبەر زەحمەتی روح کێشان وەکوو مەشکەی دەمەژا لەچاوەکانی پیرۆزی فرمێسك هاتنە خوارێ سەعد گوتی – ڕەزای خودای لێ بی – یارسول‌الله ئەمەچی یە دەگریێ • فەرمووی ئەمە ڕەحمە خودا خستویەتی یە نێو دلی عەبدەکانی خۆی بەڕاستی خودا هەر مەرحەمەت بەخاوەن بەزەیی یان دەکا لەبەندەکانی خۆی •

(ش) : لەم حەدیثە دەلالەت هەیە کە ڕەحمی خودا تایبەتە بەخاوەن بەزەیی تەواو : بەلام حەدیثی ئەبی داوود ( الراحمون يرحمهم الله ) کەمترین ڕەحمیشی دەگرێتەوە •

٣٤٣ عن انسي (رض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم · هل منكم رجل لم يقارف الليلة فقال ابو طلحة آنا : قال فانزل فنزل في قبرها ·

( تەرجەمە )

٣٤٣ دەگێرنەوە لەئەنەس کوڕی مالك - ڕەزای خودای لێبێ - گوتی لەساڵی نۆیەمی هیجری حازری جەنازەی ئومی کەلثومی کچی پێغەمبەر بووین خێزانی ئیمامی عوثمان بوو · پێغەمبەر(د) لەسەر لێوی قەبرەکەی دانیشتبوو · دیتم فرمێسکی بەچاویدا دەهاتە خوارێ · فەرمووی ئەرێ هەیە لەئێوە پیاوێك ئیمشەو موجامەعەی نەکردبێ · ئوبوطەلحە زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری گوتی من ئەم کردووە · سەبەبی تەرجیحی ئەبوطەلحە لەسەر ئیمامی عوثمان ئەمەبوو ئیمامی عوثمان ئەو شەوە لەگەل جاریەکی خۆی جماعی کردبوو پێغەمبەریش(د) · لەشدەتی ناساغی ئومی کەلثوم ئەم کارەی ئیمامی عوثمانی پێخۆش نەبوو · بەم عبارەتەمەنعی کرد لەهاتنەخوارەوە احتمال هەیە ناساغدەکەی زۆر دەوامی کردووە · ئەویش احتیاجی خۆی بەجاریەکی خۆی دەفع کردووە · ممکنە مەظەنەی - وەفاتیشی نەکردووە · ئنجا فەرمووی بە ئەبوو طەلحە · شۆڕبەوە نێو قەبر ·

(ش) ئەم حەدینە دەلیلە کەگریانی بێ دەنگنا دروستنە ·

٣٤٤ عن عمر (رض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ان الميت ليعذب ببكاء اهله عليه ·

( تەرجـەمە )

٣٤٤ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عومـەر ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی پێغەمبەری خودا(د) بەڕاستی مـردوو عەزاب دەدرێ بەگریـانی بەدەنـگی خزموکەسی ئەو • ئەم قسـەی حەزرەتی عومەر لەپاش وەفاتی بەحەزرەتی عائشەگەیشت • فەرمووی عومەر ڕەحمـەتی خـودای لێ بی واللـە ئەمـە حەدیثی پێغەمبەر نی یە ـ بەلکی حەدیثی [٣٤٥] • حـەدیثی پێغەمبەرە ـ حەدیثەکەش ئەمەیە •

٣٤٥ عن عائشة (رض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ان الله ليزيد الكافر عـذاباً ببـكاء اهله عليه •

( تەرجـەمە )

٣٤٥ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ـ ڕەزای خودای لێ بی بەرامبـەر بەحەدیثی عومەر ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ پێغەمبەر[د]• فەرمووی بەڕاستی خودا لەکافر زیاد دەکا عـەزاب بەگریانی خزموکەسی لەسەر ئەو • ئەگەر باووڕیش ناکەن بەقورئان باووڕ بکـەن • ( ولاتـزر وازرة وزر أخـرى ) یەعنی کەس بەگوناهی غـەیری خـۆی عـەزاب نـادرێ • کەوایەحـەدیثی عومەر(ڕەزای خودای لێ بی ـ کە ئەوە دەگەیەنی عەزابی مردوو بەسەبەب گریانی خزموکەسی حەدیث نی یە ) •

٣٤٦ عن عائشة (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم انهم يبكون عليها · وانها لتعذب في قبرها ·

( تەرجەمە )

٣٤٦ دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی پێغەمبەر(د) بەسەر قەبری ژنەجوولەکەیەکدا ڕەدبوو · خزم و کەسی لەسەری دەگریان · فەرمووی ئەمانە لەسەری دەگریێن · ئەویش بەڕاستی لەقەبری خۆی عەزاب دەدرێ ( یەعنی بەسەبەب کفری ) لەحالی گریانی ئەمانە · نەك لەبەرگریان ) ·

٣٤٧ عن المغيرة (رض) قال سمعت النبي صلى الله تعالى عليه وسلم يقول ان كذباً علي ليس ككذب على احد فان من كذب علي متعمداً فليتبوء مقعده من النار · وسمعت من النبي صلى الله تعالى عليه وسلم يقول من نيح عليه يعذب بما نيح عليه ·

٣٤٧ دەگێڕنەوە لەموغیرەی کوڕی شوعبە ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ گوتی بیستم لەپێغەمبەر(د) دەی فەرموو بێگومان درۆکردن بەزمانی من وانییە وەکوو درۆکردن بەزمانی یەکێکی تر مێ · چونکی بەڕاستی

هەرکەسێك درۆ بەزمانی من بکا بەقەصــــدی قــەلبی باجێگای ســکونەتی سازبدا لەئاگر وەبیستم لەپێغەمبەر(د) دەی فەرموو هەرکەسێك بەفەریاد گریانی لەسەربکرێو پێی هەلبگــوترێ • عــەزاب دەدرێ بەو گــریانو هاواری کەلەسەری دەکرێ ( ئەگەر ئەهلی عەزاب بێ ئەگەرنا ولاتزر وازرة وزر اخری ) •

٣٤٩ عن عبدالله (رض) قال رسول اللهصلى الله تعالى عليه وسلم • ليس منا من لطم الخدود • وشق الجيوب • ودعا بدعوى الجاهلية •

( تەرجـەمە )

٣٤٩ دگێرنەوە لەعبداللەی – ڕەزای خودای لێ بێ – پێغەمبــەر(د) فەرمووی • لەئێمە نیە کەسێك لەسەر مردوو لەڕوومەتەکانی خۆی بدا • وەیەقەی بدڕێنی • وەفەریادو فیغانی نامناســب لەپێ هەلگوتنی مـردوو دەست پێ دەکـا [ یەعنی ئەمە ئادابو شــەریعەتی ئێمــە نیيە • چــونکی لەشەریعەتی ئیســلامیە حــەرامە نەك یەعنی کافر دەبی •

٣٥٠ عن سعد (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم لا لا الثلث والثلث كبير أو كثير انــك ان تذر ورثتك اغنياء خير من ان تذرهم عالــة يتكففون الناس • وانك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجهاللــه الا

الا اجرت بها حتى ما تجعل في امرتك • فقلت يارسول الله أخلف بعد أصحابي • ففال انك لن تخلف فتعمل عملاً صالحاً الا ازددت به درجة ورفعة ثم لعلك ان تخلف حتى ينتفع بك اقوام ويضربك آخرون • اللهم امض لأصحابي هجرتهم ولاتردهم على اعقابهم لكن البائس سعدابن خولة يرثي له رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم ان مات بمكة •

( تەرجەمە )

٢٥٠ دەگێرنەوە لەسەعدی کوڕی ئەبیوەقاص - ڕەزای خودای لێ بی - لەسالی دەیەمی هیجری لەسالی حجة الوداع • ناساغ کەوتم • پێغەمبەر(د) زۆردەهاتەلام بۆلێپرسینم • عەرزم کرد تۆ دەبینی من زۆر ناساغم : مالیشم زۆرە • لەمنالیش عائشەی کچم نەبێ کەسم نی‌یە • ئەرێ ٢/٣ دووستی‌یەکی مالی خۆم بکەمە خێرو وەسیەت • پێغەمبەر(د) فەرمووی[نا] • گوتم نیوەی • فەرمووی(نا) پاشان فەرمووی : ١/٣ یەك سێ یەك • سێ یەك گەورەیە • یاخۆ فەرمووی زۆرە • شك لەڕاویە تۆ ئەگەر وارثەکانت بەدەولەمەندجێ بێلی باشترە لەمە نەك جێیان بێلی بۆ دەرۆزەو دەستیان بکەنەوە لەپێش خەلکی •

وە بەڕاستی تۆش هەرشتێکی خەرجی بکەی • مەقصودت پێ ڕەزای خودابێ خودا پاداشتت دەداتەوە هەتا بەو پارووە کەلەکاتی

کەمەو سوعبەت دەخەیە ناو دەمی ئافرەتەکەی خۆت . گوتم ئەی پێغەمبەری خودا ئەرێ من لەمەکە دەمێنیمەوە لەپاش رەفیقانم کەلەخدمەت تۆ دەگەڕێنەوە مەدینە . ( مەعنا ئەرێ بێبەش دەبم لەکەورەیی کۆچ کردنم بۆمەدینە لەگەل ئێوە . خەلەلێك بەکردەوەکانم ئاگا ئەگەر لەبەر نەخۆشیم لە مەکەبمێنمەوە . ) فەرمووی تۆ لەبەر نەخۆشی لەمەکە جێش بهێشتریێ . مەشغوولی ئیشی چاکیش بی مطلقاً تۆ بەکردەوەی باشی خۆت هەر دەرەجەو مەرتەبە زیاد دەکەی وەئومێدیشم هەیە تۆ لەم نەخۆشییە چاك ببیەوە وازوو نەمری هەتا هەندێ قەوم بەتۆ سوودمەند ببن ( یەعنی بەسەبەب فتوحاتی عیراق وعەجەم موسلمان غەنائم بگرن ) وە هەندێ قەومیش کەکافرن بەتۆ زەرەرمەندبین . یاخودا کۆچ کردنی ئەصحابی من بۆمەدینە جێبەجێ بکەن . وە لەئەدای هیجرەتی ئەصحابی من پەشیمان نەبنەوە . ( یەعنی ئەگەر بەمەعذەرەتی نەخۆشی لەمەکە بمێنینەوە ) . بەلام فەقیرو موحتاجێکی کەسەعدی کوڕی خەولەو وەئەبی وەقاصە ئەگەر لەمەکە وەفات بکا پێغەمبەری خودا غەمناك دەبی ( یەعنی لە مەکە وەفات ناکا ) . ئەم حەدیثە پیرۆزە لەموعجیزاتی پێغەمبەرە . چونکی ئەوەی کەعیراق و عەجەم و تاج و تەختی کسرێ کرت سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بوو . کە رەئیسی ئەرکانی جەیشی کیسرا نەعمانی کوڕی منذری ـ انذار کرد لەپاش هاتنەسەریان بەم شیعرە کەفەرموی .

فأما نرى النعمان في القيد موثقاً

واما نراه في الدماء المفرح

یەعنی : یاخۆ دەبی نەعمانی کوڕی منذر بینم بەزنجیرکراوی . یاخۆدەبی بی بینم کەلەناو خاکو خوێندایە .

٣٥١ عن عائشه (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • فاحث في افواههن التراب يعني نســاء جعفر •

٣٥١ دەگێرنەوە لەحەزرەتی عائشــە ـ ڕەزای خــودای لێبی ـ کــوی وەکــوو خەبەری ـ شەهیدبوونی زەیدی کوڕی حارثە وجــەعفەری کــوڕی ئەبی‌طالب وعبداللەی کــوڕی ڕەواحــە لەغــەزای مؤتە گــەیشتە خدمــەت پێغەمبەر(د) • لەمەدینە • بەموقتــەضای بەشــەریەت غەمنــاکی لەڕوویی پیرۆزی دەزاندرا پیــاوێك چــووە خــدمەت پێغەمبەر گوتی : ئافرەتی جەعفەرو خزم‌وکەسەکانی بەفەریاد بۆی‌دەگریێن فەرمووی بچۆ پێیان بلێ باوانەکەن • پیاوەکە چــوو هاتەوە گــوتی بەقسەیــان نەکردم دیســان فەرمووی بچۆ پێیان بلێ‌باوانــەکەن پیاوەکــە جاری‌ســێیەم هاتــەوە گوتی‌والله لەئێمە غالبترن • ئەی پێغەمبــەری خــودا • عائشە فەرمــووی وابزانم ئەمجارەی سێیەم فــەرمووی خــۆلو خاکیــان بەدەمی داکــەن • [ بۆیە بەقسەیان نەکرد چونکە هەرجارە کەدەچوو نەی دەگوت پێغەمبــەر فەرمووی وامــەکەن • هــەربەخۆی پێی‌دەگــوتن بەقســەی ئەویشــیان نەدەکرد ) •

٣٥٢ عن أنس (رض) : قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • لعل اللــه ان يبــارك لكمــا في ليلتكما قاله • لابي طلحة وزوجته حين مات ابنهما وصبرا •

( تەرجەمە )

٣٥٢ دەگێڕنەوە لەئەنەس ـ ڕەزای خودای لێبی – گوتی کوڕێکی ئەبووطەلحەمرد ( یەعنی ئەبو عومەیری کوڕی زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری وەفاتی کرد ئەبوطەلحە لەکاتی مردنی کوڕەکە لەخارجی مالی بوو دایکی کوڕەکە کەئومی سەلیم بوو دایکی ئەنەس کوڕی مالك بوو لەغەیری ئەبوطەلحە کەدیتی ئەبوو عومەیری کوڕی مردووە خواردنی لێنا جێگای ڕازاندەوە وە کوڕەکەی خۆی شووشت و کفن کرد وەبۆنی خۆشی پێوەرکردوە دای پۆشی لەلایەکی ژووری خانووی دانا وەکوو ئەبوطەلحە هاتەوە گوتی کوڕەکەچۆنە گوتی ئیستا پشیەکەی هێمنە ئەبوطەلحەش وای زانی کەپشت لەبەراستراحەتی پشی خەوی لێ کەوتووە و باش بووە ئەوشەوە لەگەل یەك خەوتن بەیانی وەکووغوسلی کرد خەبەری مردنی ئەبوعومەیری پێدا ئەبووطەلحە بۆنوێژ چووە خدمەت پێغەمبەر(د) حیکایەتی حالی صەبرو مەتانەتی ئافرەتەکەی خۆی عەرزکرد بە تەواوی فەرمووی ئومێد دەکەم کەخودا ئەم شەوەی ڕابردووی ئێوە بۆتان بگێڕی بەشەوێکی بەسوود ئینجا لەموافقاتی ئەوشەوەیان خودا عبداللەی پێدان کەبووە صاحێب نۆکوڕی زاناو قورئان خوێن کەئەوانیش ئەمانەن ١ ـ ئیسماعیل ٢ ـ اسحاق ٣ ـ یەعقوب ٤ ـ عومەیر ٥ ـ عەمر ٦ ـ محمد ٧ ـ عبدالله ٨ ـ زەید ٩ ـ قاسم

٣٥٣ عن أنس (رض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم يا ابن عوف انها رحمة ٠ ان العين

تدمع والقلب يحزن ٠ ولانقول الا مايرضي ربنا وانا لفراقك يا ابراهيم لمحزونون ٠

( تەرجەمـە )

٣٥٣ دەگێرنەوە لەئەنەس ـ ڕەزای خودای‌لێ‌بێ لەگـەل پێغەمبـەر چووینـە لای ـ ئەبوسەیفی حەداد ـ کەمێردی دایەنی ئیبراهـیمی کوڕی پێغـەمبەر بوو ٠ ابراهـیمیش لـەروح دان‌بوو پێغەمبـەر(د) ابراهیـمی ماچ‌کردو بێنی‌کرد هەردوو چاوی پیرۆزی فرمێسکی دەڕژاند عبدالرحـمن کوڕی عەوف گوتی ٠ تۆش ئەی پێغەمبەری خودا ؟٠ پێغەمبەر فەرمـووی ئەی کوڕی عەوف ئەم حالەتە کەلەمن دەبینن ئەمە ئەتەری مەرحەمەت‌و بەزەیی‌یە ٠ بەڕاستی چـاو فرمێسـك دەڕێژێ ٠ دڵیش غەمنـاك دەبێ ٠ هیچ‌شتێکیش نالێین ٠ مـەگەر شـتێك نـەبێ خـودای‌پێ‌ڕازی بکـەین ٠ وەئێمەش لەبەر جودابوونەوە لەتۆ ئەی ابراهیمی کوڕی خۆم ٠ بەڕاسـتی غەمناکین ٠

٣٥٤ عن ابن عمر (رض) قال النبي صـلى اللـه تعالى عليه وسلم قد قضـى ٠ الا تسـمعون ان اللـه لايعذب بدمع العين ٠ ولا بحزن القلب ٠ ولكن يعذب بهذا واشار الى لسانه ٠ أو يرحم وان الميـت يعذب ببكاء اهله عليه ٠

( تەرجەمـە )

٣٥٤ دەگێڕنەوە لەعبدالڵەی کوڕی عومەر ـ ڕەزای خـودای لێ بێ ٠ گوتی سەعدی کوڕی عوبادە نەساغ کەوت پێغەمبەر(د) لەگەل عبـدالرحمن کوڕی عەوف وسەعـدی کوڕی ئـەبی وەقاص وعبـدالڵەی کـوڕی مەسـعود لەکاتەکن چوونـەلای یەکجـار نـەخۆش بـوو ٠ پێغەمبەر(د) فەرمـــووی ئەرێ مرد ٠ گوتیان نا ئەی پێغەمبەری خودا ٠ پێغەمبەر(د) گریا : خەلکیش لەبەر گـریانی ئەوگـریان : فەرمـووی ئـەرێ گوێ نـادەنێ : یەعـنی گوێ بـدەنێ :

خودا لەبەر هاتنەخوارەوەی فرمێسکی چاو کەس عـەزاب ئـادا ٠ بەغەمناکی دلیش بەلام عەزاب دەدا لەبەر ئەمـە ٠ ئیشارەی بـۆ زمـانی کرد ٠ ( یەعنی ئەگـەر خـراپ بلێ : ) یاخۆ مەرحـــەمەتی پێ دەکـرێ لەبەر(ئەمە) یەعنی ئەگەر باش بلێ٠ )وە بەبێ شك مردوو عـەزاب دەدرێ بەگریانی کەس و خزمی : ( یەعنی ئەگەر بەهاواربێ و مـردووش وەصیەتی پێ کردبێ هەروەکوو لەمەپێش ڕابرد )٠

٣٥٥ عن عامر ابن ربيعة (رض) عن النبي صلى الله تعالى عليه وسلم ٠ قال اذا رأى احدكم جنازة فان لم يكن ماشيا معها فليقم حتى يخلفها او تخلفه ٠ او توضع من قبل ان تخلفه ٠

( تەرجەمـە )

٣٥٥ دەگێڕنەوە لەعامری کوڕی ڕەبیعەڕەزای خـودای ئـەویش لەپێغەمبەر

دەگێڕیتەوە(د) • فەرمووی وەکوو یەکێك لەئێوە - جەنازەیێکی دیت ئەگەر لەگەڵ جەنازەکە نەڕۆیشت • دانشتبوو • یاهەڵستی • هەتا جەنازەکەی دەخاتە پشت خۆی: یاخۆ جەنازەکە ئەو دەخاتە پشت خۆی یاخۆ دادەندرێ بۆ نوێژ یابۆشتێکی تر لەسەرملی پیاوان لەپێش ئەمە کەپیاوەکە بخاتە پشت خۆی •

(ش) زاناکان جیاوازی‌یان لێ‌پەیدابووە دەربارەی هەلستان بۆجەنازە • لای هەندێ زانا سونەتە • بەلام لای ئیمامی شافعی‌و حەنەفی ئیمامی مالك‌و ئەبویوسف ئەم حەدیثانەی دەرحەق بەواجب‌بوونی هەلستان بۆجەنازە هەموویان مەنسوخن ( واتە کاری‌پێ‌ناکرێ ) • هەندێ لەزانایانیش لەبەر حوکم بەظاهری ئەم حەدیثە گوتیتی واجبە •

٣٥٦ عن جابر (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم • اذا رأيتم الجنازة فقوموا •

( تەرجەمە )

٣٥٦ دەگێڕنەوە لەجابر - ڕەزای خودای‌لێ‌بی - پێغەمبەر(د) فەرمووی وەکوو جەنازەیەکتان دیت لەبەری هەڵستن باجەنازەی جوولەکەش‌بی •

٣٥٧ عن أبي سعيد الخدري (رض) قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • اذا وضعت الجنازة واحتملها الرجال على اعناقهم فأن كانت صالحة قالت

قدموني وان كانت غير صالحة قالت ياويلها ايـن تذهبون بما يسمع صوتها كل شيء الا الانسان ولو سمعه صعق ·

( تەرجـەمە )

دەگێرنەوە لـە ئەبووسـەعیدی خـودری ـ ڕەزای خودای لێ بێ ـ پێغەمبەر(د) فەرمووی وەکوە جەنازەیـەك داندرا لەعـارد · پیـاویش خستیانە سەرشانی خۆیان · ئنجـا ئەگەر جـەنازەکە ژیانی خۆی لەکاری باش ڕابواردبوو · دەڵێ : زوو من بکەێنیە جێگای خـۆم · ئـەگەر ژیانی خۆشی لەکاری بەد ڕابواردبێ : دەڵی : ئـەی واوەیـلاو عـەزاب بۆئـەم جەنازەیە ئـەمە بۆکـوێی دەبەن · بەهـاوارو دەنگی تەواو ( حەقیقی ) کەهەموشتێك دەبیێ نەوعی ئینسـان نـەبێ · ئەگـەر ئینسان گـوێی لێ ببایە دەمرد ·

٣٥٨ عن أبي هريرة (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم · أسرعوا بالجنازة فان تك صالحة فخير · تقدمونها · وان تك سوى ذلك فشر تضعونه عن رقابكم ·

( تەرجـەمە )

٣٥٨ دەگێرنەوە لەئـەبوو هـورەیرە ـ ڕەزای خـودای لێ بی ـ پێغەمبەر(د) فەرمووی · بەچوستی یەکی سـووك و ناوەنجی جەنازە بۆسەر

فەبر ببەن ئەگەر ئەم جەنازەیە باش بووبێ · ئەمە خێرێكو مەنافعێكــە زوو تەسلیمی جێگای خـۆی دەكەن · وە ئەگەر باشـیش نەبووبێ ئەمـە شەڕێكو بەلایێكە شتێك زووتر لە ئەستووی خۆتانی دەكەنەوە ·

– ٢٢ –

٣٦٠ عن أنس (رض) قال النبي صلى الله تعالى عليه وسلم العبد اذا وضــع في قبــره وتولى وذهــب اصحابه · حتى انه ليسمع قرع نعالهم أتاه ملكان فاقعداه · فيقولان له ما كنت تقــول في هــذا الرجل محمد صلى الله تعالى عليه وسلم · فيقول · اشــهد انه عبدالله ورسوله · فيقال انظر الى مقعدك من النار ابدلك الله به مقعدا من الجنة فيراهما جميعا · واما الكافر او المنافق · فيقول لا أدري كنت أقول مايقول الناس فيقال لادريت ولاتليت · ثم يضرب بمطرقــة من حديد · ضربة بين أذنيه فيصيح صيحة يسمعها من يليه الا الثقلين ·

( تەرجـەمە )

٣٦١ دەگێڕنەوە لەئەنــەس – ڕەزای خــودای لێبێ – پێغەمبــەر(د) فەرمووی · بەندەی ئیماندارو مخلص وەكوو لەناو قــەبری خــۆی دانــرا وە ڕەفیقەكانی ســەرقەبران بــەریان ســووڕانــد وە ڕۆیشتن بەتەحقیق

مردیەکەش گوێی لەهەستی پێلاویان هەیە . دووکەس لەمەلائکە دێنە لای پێیان دەڵێن – نەکیرو مونکر . چونکی شکل صورەتیان نەبەئینسان نەبە مەلائکە ناچێ . بەڵکی شکلیکی سەیریان هەیە . هیچ کەسێك ئولغەنی بەدیتنی ئەم صورتە نییە . ڕوویان ڕەشە چاویان شینە ) . دای دەنیشێنن پێی دەڵێن لەدونیا دەسەت چی بوو دەرحەق بەو – پیاوەی کەناوی محمەد(د) مردووە ئیماندارەکەش دەڵێ . من شەهادەت دەدەم کە ئەو پیاوە بێشك بەندەی خودایە وە پێغەمبەری خودایە . لەلایەن نەکیرومنکر پێی دەگوترێ . تەماشای جێگای خۆت بکە لەئاگر . بەڕاستی خودا ئەم جێگایەی بۆگۆڕییەوە بە جێگایەك لەبەهەشت. ئنجا هەردوو جێگایان دەبینی بەچاوی خۆی لەو کاتەدا . بەڵام بەندەی کافر . یا منافق(دووڕوو) . وەکوو ئەم پرسیارەی لێدەکەن دەڵی من نازانم لەدونیا ئەو قسەی خەڵکی دەیگوت منیش وام دەگوت . پێی دەگوترێ لەلایەن مەلائکە درۆدەکەی ئەزانیت وە تەقلیدی کەسیشت دەکرد پاشان کوتەکێکی ئاسنی لەبەینی هەردوو گوێی دەدەن . هاوارێکی وادەکا غەیری ئینسانوجن هەرچی لەئەترافی خۆی هەیە لەمەخلووق گوێیان لێدەبی .

٣٦١ عن أبي هريرة معلقاً . أرسل ملك الموت الى موسى عليهما السلام فلما جاءه صكة . فرجع الى ربه فقال ارسلني الى عبد لايريد الموت فرد الله عزوجل له عينه . وقال ارجع فقل له يضع يده على متن ثور فله بكل ماغطت به يده بكل شعرة سنة . قال اى

رب ثم ماذا • قال ثم الموت • قال فالان فسئل الله ان يدنيه من الارض المقدسة رمية بحجر قال • قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • فلو كنت ثم لاريتكم قبره الى جانب الطريق عند الكثيب الاحمر •

( تەرجەمە )

٣٦١ دەگێڕنەوە لەئەبوو هورەیرە(من) بە هەڵواسراوی یەعنی بەبێ ئیسناد وەبال پێغەمبەر(د) غەیری [فلوكنت•••الخ]•گوتی مەلەكو الموت ناردرا لای موسی ـ سەلامیخوای لێبی لەسەر شكلی ئینسانێك وەكوو هاتەلای • موساش وایزانی ئەوە ئینسانێكە بەبێ ئیزن لەسەر دیوار ئاوای حەوشە بووە • بۆكردنی كارێكی خراپ • شەقێكی لەچاوەكانیدا • چاوێكی هاتە دەرێ مەلەكوالموت گەڕاوە خدمەت خودا • گوتی منت بۆلای عەبدێك نارد • نایەوێبمری خودای گەورە چاوەكەی پێداوە • وەگوتی بگەڕێوە لای پێی بلێ دەستی خۆی لەسەر پشتی گایێك دابنێ بەهەرمویەك كەوتە ژێر دەسێ سالێك عومریهەبێ • موسی گوتی ئەی پەروەدەكەری من وەكوو ئەم سالانە تەواو بووچیدەبێ فەرمووی لەپاشان مردنە • موسی گوتی مادام مردن لەیەقەم نەبیتەوە بەهیچ حالێك • تۆش ئەی خودایە منت سەرپشك كرد(موخەیەر)• حەزدەكەم ئێستا بمرم • ئنجارجای لەخودا كرد یەك بەردناوێژ لەبیتالمقدس بەنزیك بخاتەوە هەتالەوێ بنێژرێ • (ئنجا لەسەررجای خۆی لەعومری سەدوبیستساڵی لەوێ وەفاتی كرد وەلەوێش نێژرا ) • ئەبوو هورەیرە گوتی •

پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەگەر لەوێ بوومایە • قەبرەکەی موسام نیشان دەدان •

(ش) ئەمە نابێتە نیشاندان بۆ قەبری موسی سەلامی خوای لێ بێ بۆیێ اختلاف هەیەو قەبری دیارنییە •

## ٣٦٢ عن جابر ( رض ) قال النبي صلى الله عليه وسلم في قتلى أحد • أيهم اكثر أخذاً للقرآن انا شهيد على هؤلاء يوم القيامة •

### ( تەرجەمە )

٣٦٢ دەگێڕنەوە لەجابر ـ ڕەزای خودای لێ بێ ـ پێغەمبەر(د) فەرمووی دەرحەق بەشەهیدەکانی ئوحود وەکوو دوودوو لەناوقەبرێکیدا دەنا•کامەیان عالمترن بەقورئان ( ئنجا وەکوو ئشارەی بۆبکرایە لە ئەلحەد ئەوی پێش دەخست ) • وە فەرمووی من مراقەبەی ئەحوالی ئەوانە دەکەم • ڕۆژی قیامەت بۆ لابردنی تەنگ‌وچەلەمە (شدائد)• وە ئەمری دەکرد بەشاردنەوەیان بەبێ غوسل‌و نوێژ • بەخوێنی جەسەدیانەوە •

(ش) اختلاف هەیە لەنوێژکردن • لەسەر شەهیدی شەڕ • لەمەزهەبی شافعی‌و مالك‌و احمد حەرامە • لەکاتی پێویستیش جائزە دوو دوو یاسێ‌سێ لەیەك قەبر بشاردرێنەوە • بەاتفاق باجنسیشیان جیاواز بێ • بەلام لای شافعی جەنازەی مێیەك لەگەل جەنازەی نێرێك‌و بشاردرێنەوە لەیەك قەبر بەبێ‌پێویست حەرامە • لای حەنەفی لابأس ( واتەزیانی نییە ) •

٣٦٣ عن عقبة ابن عامر ( رض ) قال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم • اني فرط لكم وانا شهيد عليكم • واني والله لانظر الى حوضي الان واني أعطيت مفاتيح خزائن الارض • او مفاتيح الارض واني والله ما اخاف عليكم ان تشركوا بعدي • ولكن أخاف عليكم ان تنافسوا فيها •

( تەرجەمە )

٣٦٣ دەگێرنەوە لەعەقەبەی کوڕی عامری جوهنی پێغەمبەر(د) • لەپاش حەوت ساڵ وشتێك ڕۆژێك چووە سەر شەهیدەکانی ئوحود ئەم دوعایەی نەلەنوێژی مردوودا هەیە ئەم دوعایەی بۆکردن • پاشان چووە سەر مینبەر • فەر مووی بەڕاستی من بۆئێوە پێشبارێکم بۆ چاککردنی حالی ئێوە لەسەر حەوزی گەوئەر ( لەمەتی گەیشتن وەفاتی نزیك بووە ) • وەمن شاهێدی دەدەم بەکردەوەی هەمووتان ( گۆیا نەمردووە هەتا کردەوەی هەموویانی دیتووەوە بەبێشك قەسەم بەخودا ئەوا ئێستا تەماشای حەوزی خۆم دەکەم وەبەبێ گومان کلیلی خەزینەکانی عاردم پێدراوە • وەبەڕاستی بەخودا ناترسێم لەئێوە کەلەپاش من شەریك بۆخودا بەیدا بکەن • لێتان دەترسێم کەلەسەر خەزینەکانی عاردەگەنجینەکانی • حەسوودی بەیەکتر ببەن • ناخۆشیتان لەبەین پەیدابێ • ( یەعنی لەسەردونیا حەریص مەبن بۆکەس نەماوە وناشمێنێ ) •

٢٦٤ عن عبد اللــه ابن عمر ( رض )عنهما قــال النبي صلي الله تعالى عليه وسلم · تشهد اني رسول الله آمنت باللــه وبرسله · ماذا تــرى · خلط عليك الامر · اني قد خبأت لك خبيئــا · اخسا فلن تعــدو قدرك · ان يكنه فلن تسلط عليه وان لم يكنه فلا خير لك في قتلــه ·

٣٦٤ دەگێرنــەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودایــان لێ بی گوتی خەبەرگەیشتە پێغەمبەر(د) زنێکی جوولەکە لەخولەفای بەنی تەجار · منالێکی بوو ناو براوە بە (صافي) جێگــای لاچــاوێکی لووســە · ێکیشــی زەقە · پێغەمبەر(د) بۆ دەفعی ئەمخەبەرەیە ( واتە بۆلابردنی ئەمخەیالە )· نەوەك ئەمە دەجال بی · لەگەل حەزرەتی عومەرو کۆمەلیك لە ئەصحابەکان بۆ زانینی حالی ـ ابن الصادی ـ ناوبراوبە ـ صافی ـ چــوون · دیتی یان لەگەل چەند منداليك گالتــە دەکــا · پێغەمبــەر(د) بۆئاگــادار کردنــەوە دەستێکی لەپشتی دا بەابن صادی فەرمووی : تۆ شــاهیدی دەدەی مــن پێغەمبەری خودام ابن صار تەماشایەکی کرد گــوتی من شــاهێدی دەدەم بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوێندەوارانی پاشــان ابن الصــاد بەپێەمبــەری گوت ئەدی تۆشاهێــدی دەدەی من پێغەمبــەری خــودام پێغەمبــەر وازی لەوەلامی پرسیارەکــەی هینا لــەبەر نائومێدبــوون لەموســولمان بوونی · فەرمووی من باوەڕیم بەخوداو هەموو پێغەمبــەرانی خوداهێنــا · پاشــان فەرمووی تۆ چــی دەبینی · گوتی هــەندێ خــەون دەبینم ڕاستە هــەندێ

دەبینم درۆیە • فەرمووی لەلایەن شـەیتان لێت شێواوە فەرمووی شتێکم بۆتۆ لەناودلی خۆم گرتووە (مەبەستی پێغەمبەر(د) لەسـورەی دوخـان ـ یوم یأتي السماء بدخان مبین • ) گوتی الـدخ • نەیتـوانی تەلـەفوظ بەتەواوی کلمەی قورئان بکا • پێغەمبەر فەرمووی چـەغە لەقـەدری خۆت تەجاوز مەکە • حەزرەتی عومەر عەرزی پێغەمبەری کرد • لێم گەڕێ بیکوژم لەملی بدەم • پێغەمبەر فەرمووی ئەگەر دەجـال بی پێت ناکوژرێ ئەمـە عائد بەعیسایە ـ سەلامی خـوالێ بی ـ ئەگـەر ئەویـش نـەبی هیچ فائدەیەك نی یە لەکوژرانی •

٣٦٥ عن أنـس ( رض ) قال النبي صـلى اللـه تعالى عليه وسلم الحمد لله الذي انقذه من النار قاله لغلام يهودي أسلم •

( تەرجـەمە )

٣٦٥ دەگێرنەوە لەئەنەس رەزای خودای لێ بی ـ منداله جوولەکەیەك هەبوو ناوی عبدالقدوس بـوو • زۆر خدمەتی پێغەمبـەری دەکرد نەسـاغ کەوت پێغەمبەر(د) چووەلای لەکن سەری دانیشت فەرمووی موسولمان بـە منالەکە ڕووی لەباوکی کـرد • باوکی گوتی اطاعـەی ابوالقاسم بکە • (د) • کوڕەکە موسولمان بوو • پێغەمبەر فەرمووی سوپاس و ستایش بۆخودایەکە نەجاتی ئەم کوڕەی دا لەئاگر •

(ش) ئەمە دەلیله ئەگەر مندالی نەبالغ عەقلی بەکفر بشکێ و مسـلمان

نەبوو لەسەر کفر بمری عەزاب دەدرێ دەلیلیشە لەسەر ڕاستی مسـلمان بوونی مندالی نەبالغ • ئەگەر وانەبێ پێغەمبـەر ئەمری پێ نەدەفـەرموو • موسـولمان ببە •

٣٦٦ عن ابي هريرة ( رضـ )قال • قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم • مامن مولود يولد الا يولد علـى الفطرة • فأبواه يهودانـه أو ينصرانه أو يمجسانه • كما تنتج البهيمة بهيمة جمعـاء هـل تحسون فيها من جدعاء •

( تەرجـەمە )

٣٦٦ دەگێڕنەو لەئەبوو هـوڕەیرە ـ ڕەزای خـودای لێ‌بی ـ گوتی فەرمووی پێغەمبەر(د)• هەر منالێك كەلەدایك بوو • مطلقـاً بەهەرحالێك هەر لەسەر خووی دینی ئیسلام لەدایكدەبی • پاشـان باوكـو دایكی ئەی گێڕن بەجوولەكـە یاخۆ بەدیـان یاخـۆ بەئـاگر پەرسـت هەر چلۆنێـك حەیوانێك ئەگەربزێ بێچوێك دەیـنی وەكوو خـۆی هـەموو ئەندامەكانی تەواوە قەت‌دەبینی گیاندارێكی هەموو ئەندامـەكانی لەشی تەواوبێ بێچوێكی لووت‌براو یاخۆ گوێ براو یاخۆ كـلك براوی ببێ یەعنی لەپاش بوونی خاوەنەكەی لەسەر فكری خۆی گوێی یاكلكی یالووتی دەبری وەكوو باوكودایكی مندالەكە • لەسەر فكری خۆیـان ئـەی گێڕن بەجوولـەكە • یا بـەدیان یابەئاگرپەرسـت • پاشـان ئـەبوو هوڕەیرە بەتەئییـدی

حەدیثی پیرۆز گوتی ئەگەر حەزدەکەن بخوێننەوە [ فطرةالله التی فطر الناس علیها لاتبدیل لخلق الله ذلك الدین القیم • ]• یەعنی بەئیعتباری حەقیقەتی حال ئەنجام هەربەتەواوی دەبێ ئەگەر کەمجار وابێ حەیوانەك بەناقصی لەدایك بێ • مەبەستی پێغەمبەر شتی کەم ناگرێتەوە • ئەحکامی شەرعی لە (عامە) وەر دەگیرێ •

## ٣٦٧ عن سعید ابن المسیب عن ابیه ( رض ) یاعم قل لا اله الا الله کلمة • أشهد لك بها عند الله أما والله لاستغفرن لك مالم أنه عنك •

### ( تەرجەمە )

٣٦٧ دەگێرنەوە لەسەعیدی کوڕیمسیەب ئەویش لەباوکی خۆی – ڕەزای خودای لێبێ – پێغەمبەر(د) لەکاتی روح کێشسان • هاتە سەر مامی ئەبووطالب • تەصادوف ئەوکاتەی • ئەبو جەهلو عبدالله کوڕی ئومیە لەوێ بوون • پێغەمبەر(د) بە ئەبووطالبی گوت • ئەی مامە بلێ • لااله‌الاالله کلمە نەجات من شاهیدیت بۆدەدەم بەم کلمەیە لای خودا • ئەبو جەهلی لەعینو عبداللەی کوڕی ئومیە گوتیان ئەی ئەبو طالب تۆ لە دینی باپیری گەورەو مینی عبدالمطلب جودا دەبی یەوە بۆ دینیکی تر • پێغەمبەر (د)چەندجار ئەم قسەی بەئەبووطالب گوت • ئەوانیش عەین قسەی خۆیان دووبارە دەکردەوە • هەتا لەدوایی ئەبوطالب گوتی • ئەو لەسەر دینی عبدالمطلبەبەبەستی خۆی بوو امتناعی کرد لەکلمەی پیرۆزی لااله‌الاالله • لەسەر ئەم حالەش پێغەمبەر(د) فەرمووی • بەحەقی خودا

من داوای لێبووردنت بۆدەکەم مـادام نەهیم لێنەکـرێ – پاشـان نایەتی ماکان للنبی ـ ٠٠ الێ لەسوورەی تەوبـە هاتە خـوارێ ٠ یـەعنی نـەهی هاتەخوارێ ٠

## ٣٦٨ عن علـي ( رضـ )مامنکم من أحـد مامن نفس منفوسة الا کتب مکانها ٠ من الجنـة والنار ٠ والا کتبت شقية او سعيدة أما أهل السعادة فيسرون لعمل أهـل السعادة ٠ واما أهـل الشقاوة فييسرون لعمل الشقاوة ٠ فأما من أعطي واتقى الاية ٠٠ الخ ٠

٣٦٨ دەگێرنـەوە لـەحەزرەتی علی ڕەزای خـودای لێبی ٠ گـوتی لەگەل جەنازەیەك بووین لەقەبرسـتانی (بەقیع) پێغەمبەر(د) تەشـریفی فەرمووە ئەوی ئێمـەش دەوورەمـان ێدا ٠ سـەری پیرۆزیشـۆڕکردەوە بۆعارد ٠ گۆیا بیرلەشتێك دەکاتەوە پاشـان فـەرمووی نی‌یە هیـچیەکێك لەئێوە هیچ ڕووحێك کەخەلق کـرابی ٠ مەگـەر بۆی نووسـراوە جـێگا لەبەهەشتو لەئاگر وە مەگەر بۆی نووسـراوە ئەمە ئـەهلی سـەعادەتە ٠ یانەهلیشەقاوەتە پیاوێکیش گوتی ٠ کەوایە ئەی پێغەمبەری خـودا ئێمـە بۆچ اعتماد بەم نووسبنەی ئەزەلیە نەکەین ٠ بۆچی تەرکی عەمەل‌نەکەین چونکی کەسێك لەئێمە بەئەهلی سەعادەت نووسرابی عـەمەل بکا یانەکـا هەر ئەهلی سەعادەتە ( ناتوانن عەمەلی ئەهلی شەقاوەت بکەن )٠ وە ئـەو کەسانەی ئەهلی شەقاوەتن سازدراون ٠ بۆعـەمەلی ئەهلی شـەقاوەت ٠

( یەعنی ناتوانن عەمەلی ئەهلی سەعادەت بکەن ) پاشان ئەم ئایەتەی لەسورەی والليل خوێندەوە ( فأما من اعطى واتقى ) ... الخ ..

٣٦٩ عن ثابت ابن الضحاك ( رض ) من حلف بملة غير الاسلام كاذباً متعمداً فهو كما قال . ومن قتل نفسه بحديدة عذب بها في نار جهنم .

( تەرجەمە )

٣٦٩ نەگێڕنەوە لەثابتی کوڕی ضەحاك ڕەزای خودای لێ بێ . پێغەمبەر(د) فەرمووی هەرکەسێك سوێند بخوا . بەمیلەتێك غەیری میلەتی ئیسلام قەصدا بەدرۆ . مەنەلەن بڵێ ببم بەجولەکە . یاخوا ببم بەگاور لەسەرشتێکی درۆ . ئەمە لەسەر ئەو دینەیە ( یەعنی کافردەبێ . لازمە باوەڕی خۆی نووبکاتەوە . وە هەر کەسێکیش بەخۆی خۆی بکوژێ . بەئالەتێکی ئاسن . چی خەنجەربێ یاشیربێ . یادەمانچەبێ بەو ئالەتە عەزاب دەدرێ لەناوئاگری جەهەنەم (ش) انتحار گەورەترە لەکوشتنی غەیری خۆی . چونکی بنا بەقسەی ئیمامی یوسف . نوێژلەسەر جەنازەی خۆکوژ (منتحر)ناکرێ . بەلام اتفاقی جمهور خۆکوژ لەئاینی ئیسلام دەرناچێ . وە نوێژیش لەسەر جەنازەکەی دەکرێ .

٣٧٠ عن جندب ( رض ) كان برجل جراح فقتل نفسه . فقال الله عز وجل . بدرني عبدي بنفسه حرمت عليه الجنة .

( تەرجـەمـە )

٢٧٠ دەگێرنەوە لەجوندوب ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ پێغەمبـەر(د) فەرمووی پیاوێك بریندار بوو لەبـەر ئازارو ئـەزیەتی برینـەکەی خـۆی کوشت خودای گەورە فەرمووی عەبدی من تالووکەی بەروحی خۆی کرد ٠ بەهەشتم لێ حەرام کرد ٠

٢٧١ عن أبي هريرة ( رض ) ٠ الذي يخنق نفسه يخنقها في النار ٠ والذي يطعنها يطعنها في النار ٠

( تەرجـەمـە )

٢٧١ دەگێرنەوە لەئەبوهورەیرە ـ ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر(د) فەرمووی ٠ هە ـ لەسێك بەخۆی خۆی بخنیکنی ٠ لەناوئاگری جەهەنەمیش بەخۆی خۆی دەخنکێنی وە ئەوکەسی بەخەنجەرو تیغ لەخـۆیدەدا لـەناو ئاگری جەهەنەمیش بەخەنجەرو تیغ لەخۆی دەدا ٠

٢٧٢ عن أنس ( رض ) قال رسول الله صلي الله تعالى عليه وسـلم ٠ وجبت وجبت هذا أثنيتم عليـه خيراً ٠ فوجبت لـه الجنة ٠ وهذا أثنيتم عليـه شراً فوجبت له النار ٠

( تەرجـەمـە )

٢٧٢ دەگێرنەوە لەئەنەس ـ رەزای خودای لێ بی ـ گوتی ئەصحابی

کیرام لەخدمەت پێغەمبەربوون جەنازەیەك بەلایاندا ڕەدبوو ئەوانەی لەوێبوون سوپاس‌وستایشی جەنازەکەیان کرد پێغەمبەر(د) فەرمووی واجب‌بوو ئەپاش کەمێکی تر جەنازەیەکی‌تر ڕەدبوو ئەصحابی‌کیرام زەمی جەنازەکەیان کرد پێغەمبەر(د) فەرمووی واجب‌بوو حەزرەتی عومەر گوتی ئەی پێغەمبەری خودا لە فەرموودەکەی تۆ نەگەیشتین مەعنای واجب بوو بۆمان ڕۆن بکەوە پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەو جەنازەی پێشو ڕەدبوو شاهیدی باشتان بۆدا خودا لەسەر شاهێدی ئێوە بەهەشتی بۆ واجب کرد وە ئەو جەنازەی پاشانیش ڕەدبوو شاهێدی خراپتان‌لەسەردا خودا عەزابی ئاگری بۆواجب کرد گویا ئێوە نیمرۆ لەسەر ڕووی عارد عەدالەت تایبەتە بەئێوە ـ شاهیدیتان مەقبوولە ـ واتە پەسندو قبوول‌کراوە ٠

## ٣٧٣ عن عمر ( رضی )أیما مسلم شهد له اربعة بخیر أدخله الله الجنة ثلاثة واثنان ٠

( تەرجەمە )

٣٧٣ دەگێرنەوە لەحەزرەتی عومەر ـ ڕەزای خودای لێ بی ـ پێغەمبەر(د) فەرمووی هەر موسولمانێك چوارکەس شاهێدی باشیان بۆدا خودا دەیباتە ناو بەهەشت حەزرەتی عومەر گوتی ئێمەش عەرزمان کرد ئەگەر سێ٣ کەسیش شاهیدی بۆ بداوایە٠فەرمووی ئەگەر سێ کەسیش شاهیدی بۆبدا وایە گوتمان ئەگەر دووکەسیش‌بی٠ فەرمووی ئەگەر دووکەسیش‌بی

(المترجم)لەبەر ئەم حەدیثە شەریفانە کە دەلـەلات دەکەن لەسەر رێزگرتنی مردوو بەسەبەب ستایشی جەنازە ٠ لازمە ئەم ستایشەو تەزکیەیە ببێتەعادەتی گشتی لەهەموو وولاتان ٠

## ٣٧٤ عن البراء ( رضى ) اذا أقعد المؤمن في قبره أتي ثم شهد ان لا اله الا الله وأن محمداً رسول الله فذلك قوله ٠ يثبت الله الذين بالقول الثابت ٠٠٠

( تەرجەمە )

٣٧٤ دەگێرنەو لەبەرا رەزای خودای لێ بی پێغەمبر (د)فەرمووی وەکوو ئیماندار داندرا بەدانیشتن لەناو قەبری خۆی ٠ نەکیرو منکر دێنەسەر پاشان لەجوابی ئەوان شاهیدی دەدا کەهیچ پەرستراوێکی ڕاستی نییە خودا نەبێ وە بەڕاستی محمدیش پێغەمبەری خودایە ئەمەیە فەرموودەی خودا کەفەرموویتی(یثبت٠٠٠الخ٠)٠ یەعنی خودا ڕادەگری ئیمانداران لەدونیاو لە قەبرو لەقیامەت بەم کلمەی شەهادەتە ثابتە(چەسپاوە) لەناودلیان ( یەعنی بەم سێ کلمەیە لەهەرسێ مەقام ئەهلی نەجاتن ٠

« بەرگی ـ دووەم ـ تەواوبوو »

# سوپاسنامە

★ بۆ کاکی فۆلکلۆر پەروەر ( سەعدوڵلا شێخانی ) کـە سـەرپەرشتی چاپی بۆ کردوم ٠ 

★ بۆ هونەرمەند ( محسن محمد امیـن ) کـە وێنـەی بەرگـەکەی بۆ کێشـاوم

( بڵاوکەرەوە )
بشیر حسین سعدی
پارێـزەر



وێنەی دانەر

مەلا حسین شیخ سعدی

* نرخی دوو دینـاره *

* سەرپەرشتی چاپ : سەعدوڵلا شێخانی *
* نەخشەی بەرگ : محسن محمد امین *

بەغدا چاپخانەی ( الامة ) ١٩٩٠